# ڕۆشنبیری نوێ



ژمارە ٨٣ مانگی کانوونی دووەم ساڵی ١٩٨١

## ژمارەیەکی تایبەتی

دەربارەی ئەو باسانەی کە لە
یەکەم میهرەجانی ڕۆشنبیری کوردی
لە هەولێر پێشکەش کران
نیسانی ١٩٨٠






- دکتور کامل البصیر
- دکتور جمال رشید
- دکتور شکریە رسول
- محمد امین هەورامانی
- ممتاز حیدری
- نیلی امین دۆسکی





میهرەجانی یەکەمی ڕۆشنبیری کوردی لە هەولێر
1980-4-20 1980-4-26
وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
المهرجان الثقافي الكردي الاول في اربيل

# رۆشنبیری نوێ

سەرنووسەر
اسماعیل رسول

جێگری سەرنووسەر
فائق جمیل

گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی مانگانەیە
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

ناونیشان:
دار الثقافة والنشر الكردية - ساحة الخلاني - بغداد
تەلەفون ٨٨٧٥٧٩٥ / پێنج خەتە


## لەم ژمارەیەدا







## وتەی ژمارە ٨

**ئاشکرایە ، هەروەك دەزگای رۆشنبیریو بلاو-کردنەوەی کوردیی ناوێکی پیرۆزو دلپرشنگەرەوەی ئاسۆی رۆشنبیریی‌کوردیی هەلگرتووە ، هەروەها بە خۆیشیا راپەرمیوە و هەول و تەقالایەکی بێ‌پایان لە چوارچێوەی رێبازی تواناى خۆیدا داوە بۆ ئەوەی کە دەورێکی یەکجار گرنگ و دیاریی لە کۆڕی بزووتنەوەی رۆشنبیریی‌دا هەبێ ، ئەویش بە هۆی بەیتاپەیتا دەرکردنی رۆژنامەی هەفتانە و گۆڤاری** مانگانەو لەچاپ‌دانی ئەو بەرهەمانە کە وەك کتێب و نامیلکە بێ و چەندەها شتی دیکە لە گۆشەی رۆشنبیریی هەمەجۆردا و دەستی یارمەتی راکێشان بۆ ئەوانەی کە خاوەنی بەرهەمی بە پێزن و توانای لەچاپ‌دانیان نی‌یەو هەولو تەقالادان بۆ وەرگێڕرانی کتێب و وتار لە زمانی عارەبی و زمانانی بێگانەوە بۆ زمانی کوردیی و بلاوکردنەوەیان بە مەبەستی گەشە کردنی رۆشنبیریی کوردیی و متوربە کردنی بە رۆشنبیریی عارەبی و هی جیهانی لە ڕوالەتی سوودوەرگرتن لە شتی باش و لایەنی سوودبەخش و لادان ر پشت‌گوێ‌خستنی ئەو لایەنانەی کە نەك تەنها سوودیان نی‌یە لەوانەشە زیان بدەن و ببنە کۆسپ لە رێبازی گەشەکردنی رۆشنبیریی‌کوردیی پێشکەو - تنخوازی‌دا ؛ کە ئاواتە ؛ روالەتێکی رازاوە بە خۆیەوە ببینێو شان‌بەشانی رۆشنبیریی‌جیهانی بەرەو پێشەوە بڕوا .

هەروەها ، بۆشمان روونە ، تەنها چالاکی‌یەکانی دەزگای رۆشنبیریی و بلاوکردنەوەی کوردیی بەوەوە نەوەستاوەتەوەو کومسایی پێ هێنانی و بە بەسی بزانی ! نەء ، هەرچەندە خۆی خەریك بکات و **میهرەجانو کۆڕی ئەدەبی‌ی و بەیەکگەیشتنی هونەریو وێژەیی دیکە بگێڕێ هەر بەکەمی دەزانێو هەمیشە هەر هەولو تەقالای زیاتریەتی ، جگە لەوەش زۆر بە تیژیو بە وردیی بەو نیشانەی‌دا دەڕواتەوە بۆ ئەوەی سوودیی لە هەموو روویەکەوە لێ وەربگری و خۆی لەو هەلەو لاوازی‌یانە کە تێیان کەوتووە ، لابدا ، هەروەها ئەو لایەنە باشانە وەك بەرنامە لە بەرچاوی** خۆیەوە زیاتر تێ‌بینیان دەکات و هەولو تەقالای ئەوە دەدات کە هەمیشە لە هەموو کارێکی ئایندەی جەماوەریی‌رۆشنبیریی تری‌دا رەچاویان بکات و رێگاو رێبازی باشترو بەرهەمی فراوانترو ئیبداعی باشتر فەراهەم بهێنێ ... جگە لەوەش ئەوەشی خستوەتە

بەرچاو کە هەر کردەوەیەکی رۆشنبیریی ؛ بەرهەمی باشی دەبێو بە هۆی رووداوی هەندێ لایەنی لاوازو نالەباریشەوە هەندێ هەڵە روو دەدەن ؛ بۆیە لێکۆڵینەوە لەو هەڵانەو لێوورد بوونەوە لێیان وەك ئەرکێکی گرنگ لە بەرنامەی رۆژانەی خۆیدا دیاریی کردوون .

سازکردنی میهرەجانی یەکەمی رۆشنبیریی کوردیی لە هەولێر یەکێك بووە لەو چەندەها چالاکیانەی کە دەزگای رۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردیی وەك بەرنامەیێ بۆ خۆی دایناوە و دەیەوێ جێبەجێیان بکات . .

دیارە ، ئەم میهرەجانە ، خۆی لە خۆیدا ، ئەگەرچی بە هۆی رواڵەتی سروشتیی کاری وەهاوە ، ناو بە ناو هەندێ هەڵە بوونە هۆی لاوازیی هەندێ لایەنی کارەکە ، لە رووی بەرێوەبردنی و سازکردنیەوە لەگەڵ ئەوەشدا خۆ پیشاندانێکی رۆشنبیریی کوردیی گەورە بووە و جێگای شانازیشە و شایەنی یادکردنەوەشە ئەگەر هاتو رواڵەتی سروشتی گرتنی جۆرە میهرەجانی وەهاو بەرپابوونی دەیەها تەنگو چەڵەمەی بەر رێبازی رەچاو بکرێن و لێیان وورد ببینەوە . .

**جا ، لەبەر ئەو هۆیەی سەرەوە جێگای خۆیەتی لایەنی لاوازیی لە لایەن رۆشنبیرانەوە چاوپۆشی لێبکرێ و ریز و نرخ لێبنرێو بخرێتە سەر لایەنەکانی دیکەی . . بەڵام دەزگاکە خۆی ، هەروەك وتمان وەك ئەرکێك هەرگیز ئەوانە پشت گوێ ناخات و نەخشەی چارەسەرکردنیان وەك فلیمی سەر پەردەی سینەما هەمیشە لەبەر چاویەتی .**

میهرەجانی یەکەمی رۆشنبیریی کوردیی لە هەولێر جگە لەوەی کە خۆ پشاندانێکی رۆشنبیریی گەورە بوو و بۆ یەکەم جاریشە شتی وەها دەکرێت و هەروەها بە پیریی چوونێکی رۆشنبیریی مەزنبوو ، ئەوە بوو جەماوەرەکەی دیکەش لەملاو لەولاوە و پەیتا پەیتا بۆی دەکۆشان . حەزیان بە بەشداری کردنی دەکرد تامو لەززەتیان لێ وەر دەگرت .

بێگومان ، ئەم هەنگاوە گەورەیە چ لەلایەن روشنبیرانو جەماوەری روشنبیری کوردەوە چ لەبەر چاوی دامودەزگاکەوە زۆر رێزی لێ دەنرێ ، ئەوەتا هەر خەریکی بەرپاکردنی چالاکیو کۆڕی رۆشنبیریی ترە ، کە وەك بەیەکگەیشتنی شیعری کلاسیکی کوردیی کە لە نیوەی مانگیدەیەمدا دەگیرێ و بەیەکگەیشتی چیرۆکی کوردی کە ئەویش نیاز وایە بە شوێن ئەوەوە بێ و چەندەها هی تریش . .

**جا، ئەگەر ئێمە خەریکی گورجو گوڵی رۆشنبیری وەهاو هەمە جۆر چالاکی هونەریی و رۆشنبیریی تری کوردیی ببین دەبێ لە هەڵە نەترسین و بە هۆی روودانیەوە لە گوونجی دوورکەوتنەوەو دوورە ـ پەرێزییدا جێگیر نەبین ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێ ئامادەی هاریکاریی کردن بینو بۆ ئەوەی ئەو بۆنە خۆشە رۆشنبیریییە لە سندوقێکی پۆلاییندا کلۆم نەدرێو خۆی هەشار نەداو بە ئاوو هەوای ئاسۆی رۆشنبیریدا خۆی پرژو بڵاو بکاتەوە .**

لەوانەیە ، هەندێ نووسەران ، یاخود رۆشنبیران رەخنەمان لێ بکرن بۆ ئەوەی گوایا ، ئا لێرەدا ، واتە ئەم ژمارە تایبەتییەی (رۆشنبیری نوێ)ـ یەدا هەندێ وتاری میهرەجانەکەی تێدایەو هەندێکی دیکەشی تێدا نییە ، یاخود پشت گوێ خراون !!

ئەم پرسیارە جێگای خۆیەتی بۆ یەکێك شارەزای رێبازی رۆژنامەکەو گۆڤارەکانمان نەبێ . خۆ ئەگەر شارەزاش بێ پرسیاری وەها ناکاتو وەڵامی ئەو پرسیارەش ئەگەر بەرگوێی کەوت دەداتەوە کەوا وتارو لێکۆڵینەوەو توێژینەوە تایبەتییە بە ( رۆشنبیری نوێ )وە ، وتاری ئەدەبیو وێژەییش تایبەتین بە (بەیان)ەوە ، خۆ ئەوە (هاوکاری)ش دیارییە . .

**شایەنی باسە بڵێین ، ئەو و تارانەی کە لێرەدا بڵاو نەکراونەتەوە ، بایەخی تایبەتی خۆیان لە جێگایەکی دیکەوە ، لە گۆڤاری (بەیان)و (هاوکاری)دا، پێ دەدرێ . .**

رۆشنبیرانی خۆشەویست ، ئاشکرایە بە بەشداریی بوونی هەردوولامانەوە ئەوجا دەتوانین کۆڕی رۆشنبیریی شایستە ساز بدەین ، جا ، وایە ؛ **بۆیە ، هەمیشە بە روویەکی پاکو رۆشنەوە داواتان لێ دەکەین و چاوەڕوانی بەشداریی کردنیشتانین بۆ چەندەها کردەوەی رۆشنبیریی دیکە ، بۆ بەیەکگەیشتنی کۆڕی شیعری کلاسیکی کوردیی ، بۆ بەیەکگەیشتنی کۆڕی چیرۆکی کوردیی و هیتریش .**

# لاسایی کردنەوەو ڕەسەنی لە ڕەخنەسازیی کوردیدا

دکتور کامل البصیر



نوێژەر ئەگەر بیەوێت بەبەر تیشکی ڕێبازێکی زانستیدا دیاردەی لاسایی کردنەوەو رووگەی ڕەسەنیی لە ڕەخنە سازیی هەر نەتەوەیەکدا دەستنیشان بکات پێویستی بە چەسپاندنی پێناسەی ڕەخنەسازیی هەیە .

پێناسەی ڕەخنەسازیش لەبەر ئەوەی تاریکیی بیری‌و هۆشمەندی‌و سۆزی‌یە نەتوانراوە تا ئێستا ناکامێکی سنووردارو یەکگرتووی دوور لە مشتومڕی زاناو ڕۆشنبیران بۆ ڕەچاو بکرێت .

ئەم بارەی ڕەخنەسازیی زەمینەیەکی بەپێتی لەبەر دەستی توێژەراندا خۆش کردووە ، بۆ ئەوەی هەریەکێکیان بەگوێرەی بۆچوون‌و مەبەستی تایبەتی‌و ئایدیۆلۆژیەتی بیری‌و هونەریی خۆی جەمەکی ئەم کارە بخاتە ڕوو .

سەرئەنجام سەبارەت بە ڕەخنەسازی پێناسەی جۆربەجۆر لە دێرترین سەردەمەوە بەرچاو دەکەوێ‌و هەڵسەنگاندنی یەکدگیر نەبوون دەرهەق بە ئەرکی ڕەخنەساز هاتۆتە کایەوە .

ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئامانەوێ خۆمان لە لێشاوی ئەم بابەتە تێ بگەیەنێنین ، چونکە ئامانجی سەرەکیمان پەردە ڕامالێنە لەسەر دیاردەی لاسایی کردنەوە لە ڕەخنەسازیی نەتەوەکەماندا بە نیازی ئەوەی ئەم نەخۆشیە بنج بڕ بکەین بەرلەوەی زیاتر تەشەنە بکات‌و خونچەی ڕەسەنی لە بەرهەمە ڕەخنەسازیی دێرین‌و هاوچەرخەکانماندا بپارێزین‌و دەرفەتی پشکووتوونی ساز بکەین .

ئەم ئامانجە هەڵبەت دیسانەوە ڕامانده‌کێشێت بۆ چەسپاندنی سروشتی ڕەخنەسازیی‌و دەستنیشان کردنی ئەرکی ڕەخنەساز ، جاکەوابوو دووبارە خۆمان لە لێشاوی جیاوازی توێژەران‌و مشتومڕیان دوور دەخەینەوەو تەنیا سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین کە ئەو توێژەرانە لە دەستنیشان کردنی سروشتی ڕەخنەسازیدا بە زۆری دوو کۆمەڵن :-

کۆمەڵێکیان بڕوای وایە کە ڕەخنەسازی کارێکی هونەرییە . لە سۆزو کەسایەتی ڕەخنە سازەوە بەرامبەر بە تێکستێکی وێژەیی هەڵدەتوڵێ .

کۆمەڵەکەی دی بڕوای بەوە هێناوە کە ڕەخنەسازیی زانستێکە ، ڕەخنەساز بە هۆی چەند بنەواشەو دەستوورێکەوە ئەنجامی دەدا ، بیروڕای کۆمەڵی یەکەم لە چوارچێوەی پەیوەندی ڕەخنەسازی بە نەتەوەکەیەوە سەرئەنجامێکی یەکدگیر سەبارەت بە لایەنێك لە لایەنەکانی لاسایی کردنەوەو ڕەسەنی دەدا بە دەستەوە ، ئەم سەرئەنجامەیش ئەوەیە کە دەڵێ :

لەبەر ئەوەی ڕەخنەسازیی هونەرێکە هەردەبێت ئاکامی کەسایەتی ڕەخنەساز بێت ، ڕەخنەسازیش چونکە ئەندامێکە لە ئەندامەکانی نەتەوەیەك پێویستە

ناکامەکەی ڕەنگدانەوەی چەشەو چێژی ئەو نەتەوەیە بێت .

باوەڕی کۆمەڵی دووەم بە پێچەوانەی سەرئەنجامی بیروڕای کۆمەڵی یەکەمە . وە بڕیارێك سازدەکاتو دەڵێ : ڕەخنەسازی هیچ پەیوەندیەکی بەسنووری نەتەوایەتی‌یەوە نی‌یە ؛ چونکە هیچ پەیوەندیەکی بە کەسایەتی رەخنەسازەوە نەبووەو نابێت ؛ هەموو جیهان کە شانۆی ژیانی گشت . نەتەوەکانە کێلگەیەتی‌و بەزەبری یاسای گشتی‌و ناموسی هەمیشەیی سنووری ئەماوە نەیشکێنن‌و نەبێ بە هاوڕێی عەقڵ‌و زیری ئادەمیزاد دوور لە جیاوازی ڕەگەزیی‌و ئایدیۆلۆژی .

هەڵوێستی ئێمە لە نێوانی ئەم دوو کۆمەڵەدا بێگومان نابێ ناوبژی‌کەر بێت‌و دەست بۆ ئەم لاو ئەولا درێژ بکات‌و لەمو لەو قەرز بکات ، بەڵکو دەبێت لەسەر بناغەی بواری ڕەخنەسازی خۆی دابمەزرێ . بۆیە لێرەدا پێویستە پەنجە بۆ دوو ڕاستی ڕابکێشین :-

**ڕاستی یەکەم :**

ئەوەیە کە ڕەخنەسازی مامەڵە لەگەڵ وێژەدا دەکات ، وێژەش دەبێ هەستومەری هونەرێکە ، هونەریش بێگومان ئاوێنەی هەستو ئەستو سۆزو هەڵچوون‌و چەشەو چێژو تێڕوانینی ئەلەوەیەکە کە بوون‌و قەوارەکەی بەگوێرەی قۆناغی مێژووی باری ئابووری‌و سامانی دێرینی شەقڵی تایبەتی خۆی وەردەگرێ .

**ڕاستی دووەم :**

هەر لە ڕوانگەی ڕاستی یەکەمەوە دووپانی دەکاتەوە کە ئەم مامەڵەکردنە ئامانجی دەستنیشان کراوی هەیەو لە بابەتێك دەکۆڵێتەوە ئاسۆکەی دەبێت فراوان بێت ئەگەر هاتو بابەتێکی ئادەمیزادانە بوو . چونکە ئادەمیزاد چەند هەوڵ بدات لە سنووری نەتەوەیەکدا گوشەگیر بێت بەتایبەتی لەم ڕۆژانەدا ناتوانێ خۆی لە دەورووبەری نەتەوەکەی‌و جیهانی هاونێشی‌و ئازارو خۆشی‌و ئاواتی بپچڕێنێ .

ئەم دوو ڕاستی‌یە هەروەکو دیارە هەڵوێستەکەمان بنیات دەنێن‌و ڕێگای ئەوەمان دەدەن کە بڵێین :-

ڕەخنەسازی نە هونەرێکی ڕووتەو نەزانستێکی پەتی‌یە ، بەڵکو کارێکی زیری‌و چەشەیی‌یە لە ئاوێنەی گیانی داهێنانی هونەرو تیشکی دەستووری زانست ئەنجام دەدرێ .

تویژەران جگە لە دەستنیشانکردنی سروشتی ڕەخنەسازی سەبارەت بە ئەرکی ڕەخنەسازیش جیاوازیگەلێك لەیەکتر دەیانپچڕێنن :-

هەندێکیان بۆچوونیان ئەوەیە کە ڕەخنەساز تێکستی وێژەیی‌و بەرهەمی وێژەران بە دابین کردنی لایەنی چاکەو خراپە هەڵدەسەنگێنن .

هەندێکی‌تر بڕیاری ئەوە دەدەن کە ڕەخنەساز وێژەرێکی سەرنەکەوتووە خۆی لە کاروباری وێژەرە سەرکەوتووەکاندا هەڵدەقورتێنێ . ئێمە دووبارە گەر بمانەوێ لەم مەسەلەیەشدا هەڵوێستی خۆمان لەسەرەتاوە بخەینە ڕوو سەرنج بۆ پووختەی کاری ڕەخنەسازی لای نەتەوە خاوەن ڕۆشنبیری‌و شارستانیەتیەکاندا ، ڕادەکێشین‌و تێبینی دەکەین ڕەخنەسازی هۆی سەرەکی پێگەشتن‌و خەملاندنی وێژەیەو ڕەخنەسازە ڕاستەقینەکان هەمیشە ڕابەری وێژەرانیان لە کۆڕی جێ‌بەجێ کردنی داخوازی نەتەوەکانیاندا کردووە .

سەرئەنجام هەڵوێستمان لەم ڕووەوە ئەوەیە کە ڕەخنەساز نەکابرایەکی چاوەڕێ‌کەری دەستی وێژەرە بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی هەڵبسەنگێنێ‌و نە وێژەرێکی سەرنەکەوتووە بە هۆی وێژەرە سەرکەوتووەکانەوە ناوی خۆی بڵاوبکاتەوە ، بەڵکو ڕەخنەساز ئەندازیاری وێژەیە : بەواتای ئ ... ەمەی ئەرکی ڕاستەقینەی چەسپاندنی بناغە گشتی‌یەکانی لەدایکبوونی بەرهەمی وێژەری پێویستە .

جاکە بەم جۆرە سروشتی ڕەخنەسازی‌و ئەرکی ڕەخنەسازمان دەستنیشانکرد دەتوانین بە ڕوونی پێوانەی لاسایی‌کردنەوەو ڕەسەنی لە ڕەخنەسازی کوردیدا بەهۆی دوو خاڵی سەرەکی‌یەوە بچەسپێنین :

**یەکەم**

ڕەخنەسازی چونکە ڕەگێکی زانستیی گشتی‌و جیهانی پێوەیە نابێ گۆشەگیر بێت‌و لە چوارچێوەیەکی تەسکی ناوچەیەك یان نەتەوەیەك بەنگ بخواتەوە . سەرئەنجام ئەگەر هاتو سوودی لە تاقی‌کردنەوەی ڕەخنەسازی جیهانی وەرگرت بەهیچ جۆرێك نابێت ئەم سوود وەرگرتنە بەلاسایی‌کردنەوەو ناڕەسەنی لە قەڵەم بدرێت .

**دووەم**

ڕەخنەسازی کە بە بۆنو بەرامەی هونەر قوڵپ دەداتو بە چەشەو چێژی نەتەوەیەك ڕەنگ دەداتەوە ناشێ بە لەبەرکردنی بەرگی بێگانەی نانەتەوایەتی نیشانەی ڕەسەنی بدرێتێ .

ئەم هێڵە گشتیانەی چەمەکمان دەربارەی ڕەخنەسازیو ئەرکی ڕەخنەسازو پێوانەی لاساییکردنەوەو ڕەسەنی هەڵبەت پێویستیان بە کەشتێکی مێژوویی هەیە . بۆ ئەوەی بزانین ئەم ڕەخنەسازی کوردییە لە کوێوە سەری دەرهێناوەو بەرەوکوێ هەنگاو هەڵدەگرێتو باری بەدیهێنانی پێویستی سەرشانی لەچی دایە ؟

سامانی نەتەوایەتی دێرینی کوردی لە هۆنراوە بە هەر پێوانێك هەڵبسەنگێنری بێشك بەرهەمی وای تێدا بەرچاو دەکەوێت کە شیاوی ڕێزو نرخ پێدانە . چونکە مێژوونووسی وێژە لە دوورتووێی ئەو سامانەدا تێبینی دەکات کە هەڵبەست هەیە لە ڕووی بنیاتنانو تەکنیکی داڕشتنەوە داهێنراوە وەکو چوارینەکانی بابەطاهیری هەمەدانی · هەروەها هەڵبەست بەدی ئەکرێ کە لە ڕووی ناوەڕۆکو بەیامداریەوە نموونەی بەرزی هۆنراوەی نەتەوایەتین وەکو بەرهەمەکانی عەلی تەرموکی · جگە لە هۆنراوەی درامی کە مەموزینەکەی ئەحمەدی خانییە کە لە ڕووی ڕەگەزەکانی ئەم هونەرەوە لووتکەی خوڵقاندنو جوانکارییە ·

مێژووی ڕەخنەسازی جیهانی لەبەر دەستی ئەم دیاردەیە لە هۆنراوەی کوردیدا کە بێگومان ڕەگو ڕیشەیەکی ئێجگار دێرینی هەیە ، بوونی ڕەخنە سازییەك دەسەلمێنێ · چونکە دووپاتی کردۆتەوە کە پێگەیشتنی هۆنراوەو خەملاندنی دەگەڕێتەوە سەر بەرپابوونی ڕەخنەسازییەکی زانستیی کاریگەر ·

کەوابوو دەبێ ڕەخنەسازییەکی دێرینی کوردی هەبوو بێت . بەڵام بەداخەوە ئەم ڕەخنەسازییە کوردییە دێرینە بەکتێبو ووتارو چەشنەکانی تری دانان بە دەستی ئێمە نەگەیشتووە . بۆیە ئەگەر ئێمە لێرەدا نەیشتنی کتێبو ووتاری ڕەخنەسازی بکەین بە چرای دۆزینەوەی سەرەتای مێژووی ڕەخنەسازی جیهانی بە نیازی دەستنیشان کردنی دیاردەی لاسایی کردنەوەو ڕووگەی ڕەسەنی لە ڕەخنەسازی کوردیدا ، دەتوانین لەگەڵ مێژوو نووسەکاندا دووپاتی بکەینەوە کە کۆنترین بەرهەمی ڕەخنەسازی نەتەوەکان ڕەخنەسازی ( ئەغریقیە ) ، چونکە تەمەنی کتێبو ووتارەکانی ئەم ڕەخنەسازییە لە ( ٢٥٠٠ ) دوو هەزارو پێنج سەد ساڵ پترە ·

دوا بە دوای ڕەخنەسازی ( ئەغریقی ) ئەوسا ڕەخنەسازی دێرینی عەرەبی دێت کە تەمەنی بەرهەمە دەماودەمەکانی نزیکەی ( ١٨٠٠ ) هەزارو هەشت سەد ساڵ دەبێت ·

لێکۆڵینەوەی بەرهەمی ڕەخنەسازی ( ئەغریقی )و ڕەخنەسازی ( عەرەبی ) دێرین بۆ خستنە ڕووی دەنگ دانەوەیان لە ژینگەی ڕەخنەسازی کوردیدا هەڵبەت لێرەدا دەبێ کورتو بە هێڵی گشتی بێت . بۆیە لە مەیانی بەرینی ڕەخنەسازی ئەغریقیدا تەنیا سەرنج بۆ هەندێك لە بیروڕاکانی افلاتونو سۆفستایەکانو ارستو ڕادەکێشین کە بناغەی بەرپابوونی ڕێبازە سەرەکییەکانی ڕەخنەسازی هاو چەرخی ئەورووپین :ـ

افلاتون ڕەخنەسازی هۆنراوەی بە توندی لەگەڵ تیوورییە فەلسەفیەکەیدا سەبارەت بە بوونی سێ جیهان بەستووە ، ئەم تیوورییەش هەروەکو ( زانراوە )(١) دووپاتی دەکاتەوە کە بۆ زانیاری ئادەمیزاد سێ جیهان هەیە :ـ

**یەکەم**

جیهانی ( ئایدیا ) یە واتە ( عالم المثل ) کە داهێنراوو خولقێنراوەو شانۆی گەوهەری هەموو گیانلەبەرێتیکە ·

**دووەم**

جیهانی هەستپێکراو واتە (عالم المحسوسات) کە دروستکراوەو لە هەموو گیانلەبەرێکی ئەم سەرزەمینە سازکراوە ·

**سێیەم**

جیهانی سێبەر واتە ( عالم الظلال ) کە هونەرمەندەکان بە هۆی هونەرە جوانەکانو هونەرە بە سوودەکانیانەوە دەستکردانە دەیهێننە کایەوە .

افلاتون هۆنراوە وەکو بەشەکانی دی هونەر لەبەر تیشکی ئەم تیوورییەدا بە بەرهەمێکی زیانبەخشو چاوبەستو دەستبڕوو درۆ لە قەڵەم دەدا ، چونکە ئەنجامدەرەکەی کە هەستیارە بەلاساییکردنەوەی جیهانی هەستپێکراو ڕێکی دەخات . جیهانی هەستپێکراویش خۆی لە خۆیدا دوو هەنگاو لە جیهانی ئایدیاوە کە تاقە جیهانی ڕاستیو ڕاستەقینەیە دوورە . هۆنراوەیش سەرئەنجام بە سێ هەنگاو لە ڕاستییەوە پچڕاوە ، ئەم بڕیارەی افلاتون لە پوچەڵکردنەوەی هۆنراوە لەو ڕادەیە ڕاناوەستێ بەڵکو بە توندی ئەنجامدەرەکەی کە هەستیارە لە هەموو کردەوەیەکی بەنرخ بێبەری

نەتات و دەیسەلمێنێ کە تەنانەت هۆنراوەی ستایشیش و ئاینی کە ناوەڕۆکەکەی سوودێکی هەیە خاوەنەکەی بە هۆی خورپەو ئیلهامەوە بەبێ هۆشی و ئاگاداری لە خوای هۆنراوەوە وەدەستی دەهێنێت ·

مێژوو نووسەکانی ڕەخنەسازی ئەغریقی ئەم هەلوێستەی افلاتون سەبارەت بە هونەری هۆنراوو هەستیار بەکاردانەوەیەکی ئایدیولۆژی و ئاینی دژ بە سۆفستایەکان ڕاڤە دەکەن کە لە فەلسەفەو ڕەوانبێژیدا ڕوایان بە هیچ بنەڕەتێکی خوو ڕەوشتی و زمانی نەبووەو لە کۆڕی زمانی هۆنراوەدا بیروڕایان وابووە کە هەستیار ئەو پەڕی سەرنەرازە لە سازکردنی ڕەمزو وێنەی هونەری و دەستکاری کردنی واتای ووشەی فەرهەنگی و خوازەی بەبێ دەستوورو بەبێ سنوور ·

ئەرستو کە شاگردی افلاتون بوو هەرچەندە وەکو مامۆستاکەی هۆنراوەی بەلاسایی کردنەوەی سروشت پێناسە (٢) کردووە · بەڵام بیروڕای ئەوە بووە کە بەرهەمی ئەم لاسایی کردنەوەیە لە سروشت بەرزترەو هەستیاری داهێنەری هۆنراوە کەمو کوڕیەکانی جیهانی هەستپێکراو بە هێزی ئەندێشەو توانای سۆزو هەلچوون تەواو دەکات ·

سەرچاوەی هەلبەستیش بەلایەوە دەروونی هەستیارە ، کە دەشێ دەروونێکی چاک و خێرخواز بێت و دەشێ دەروونێکی خراپ و شەڕمەند بێت : دەروونی چاک و خێرخوازی هەستیار لە بەرەبەیانی لەدایکبوونی هۆنراوەوە هەلبەستی ستایشی ئەنجام داوە ، هەلبەستی ستایش قوناغ بە قوناغ پەرەی سەندووەو گۆڕاوەو بووە بەهۆی بەرپابوونی هۆنراوەی شانۆگەری تراجیدی کە بەرزترین چەشنەکانی هۆنراوەیە ·

دەروونی خراپ و شەڕمەند لە دێرترین سەردەمەوە بە هۆنراوەی جوێنداننو هەجوو قولپی داوە · هۆنراوەی جوێندان و هەجوویش خەملاوەو ڕێگای دەستکاری کردنی گرتۆتەبەر تاکو بەهۆیەوە هۆنراوەی شانۆگەری کۆمیدیا داهێنرا کە لە کۆڕی گاڵتەو گەپ و ڕەخنەسازی کۆمەلایەتیدا پلەیەکی هونەری بەرزی داگیرکردوە ·

لەسەردەمی ڕاپەڕیندا کە میللەتە ئەوروپی یەکان لە چنگی دەسەڵاتی دەزەبەکایەتی ڕزگاریان بوو لە کۆڕی ڕۆشنبیری بەگشتی و ڕەخنەسازیدا بە تایبەتی کتێبە دێرینەکانی افلاتون و ارستویان کرد بە بناغەی ئاکامی ئەم کارەش لەوەدا بەدی دەکرێت کە یەکەم ڕێبازی هۆنراوەی ڕەخنەسازی ئەوروپی زاراوەی کلاسیزم ناوبراوە :

زاراوەی کلاسیزمیش ووشەیەکە کە لە فەرهەنگی ئەغریقیدا بە واتای کۆمەڵە کەشتیەکو پۆل(٣) هاتووە لە ڕەخنەسازی‌دا چەمەکی هۆنراوەی شانۆگەری تراجیدیەو کۆمێدیەی کە چەند تایبەتیەکی ناوەڕۆکی و تەکنیکی و ئایدیۆلۆژی دەگرێتە خۆی ·

پاش ئەوەی نەتەوە ئەوروپی یەکان زیاتر لەیەکتر بچڕان و قەوارەی نەتەوایەتیان بە سنووری ڕۆشنبیری تایبەت و زەوی دەست نیشان کراو و ئابووری ڕەوت جیاواز هاتە کایەوە وازیان لە زمانی لاتینی گشتی هێناو زمانی ناوچەییان پەرەی سەند . لە کۆڕی ڕەخنەسازی‌دا زاراوەی ڕۆمانتیزم پەیوەند بەم بارەوە لەدایکبووە کە لە بناغەدا(٤) لە ووشەی (ڕۆمانیوس)ـەوە وەرگیراوە . ووشەی (ڕۆمانیوس) یش ناوێکە بۆ ئەو زمان و وێژە نەتەوایەتیانە کە لە زمان و وێژەی لاتینی کۆن جیابوونەوە ·

زاراوەی ڕۆمانتیزم لە جیهانی وێژەو ڕەخنەسازی دا نازناوێکە بۆ ئەو بەرهەمانە کە لە ڕووی ناوەڕۆک و فۆرمەوە ئاکامی بارێکی کەسی و ئەخۆشی سەردەم و ڕووگەیەکی ئایدیۆلۆژین سەر بە دەزگەتی میللەتە ئەوروپی یەکان لەسەردەمی شەڕو شۆڕو شکستەی نەتەوایەتی و دەروونیدا کە لە ڕووی مێژوووەوە سەدەکانی شۆڕشی پیشەسازی و پەیدابوونی چینی (پتی بورجوازی) واتە بورجوازی بچووک و (گرۆند بورجوازی) واتە بورجوازی گەورە دەپۆشێ .

لە سەردەمی توند بوونی زۆرانبازی نێوانی چینە میلەتە ئەوروپی یەکان لە جیهانی ڕەخنەسازی‌دا دروشمی وێژە بۆ میللەت بەرزبووەوە کە لەبەر چەند هۆیەکی بیری و ئابووری بوو بە بناغەی لە دایکبوونی ڕێبازی ڕیالیزم ·

ئەم ڕێبازە لە ڕوانگەی مێژووەوە کاردانەوەیەکە دژ بە بیروڕاکانی افلاتون و ، هەندێك لە لایەنەکانیش پەیوەندیان بە تێڕوانینەکەی ( ئەرستو ) وە سەبارەت بە ئەرکی هۆنراوەوە هەیە جگە لەوەی ـ هەروەکو وتمان ـ ئاکامی گۆڕانی باری ئابووری میللەتە ئەوروپی یەکان جا بۆ ڕونکردنەوەی ئەم ڕاستی یە سەرنج بۆ سێ تایبەتی گرنگی ئەم ڕێبازە ڕادەکێشین و ڕەگوڕیشەکانی دەخەینە ڕوو :ـ

**ڕاستی یەکەم :**

ئەوەیە ئەفلاتون هۆنراوەی بەلاسایی کردنەوەی سروشت واتە جیهانی هەستپێکراو لە قەڵەم دا ، بەمانای ئەوەی بەرهەمی وێژەیی لە ڕوانگەی ئەم مەیلەسوفەوە پەیوەندیەکی ڕاستەو خۆی بەواقیعەوە هەیە ڕەخنە سازیە ڕیالیزمیەکانیش لە هەمان ڕوانگەوە سەرچاوەی وێژەیان دەستنیشان کردووە هەر چەندە لەگەڵ خاوەنی ئەم ڕوانگەیەدا کە ئەفلاتونە جیاوازایەکی فەلسەفیان چەسپاندووە کە ووتویانە وێژە بۆ میللەت بە کەڵکو بە سوودە .

**ڕاستی دووەم :**

پەیوەندی بە بیرو ڕاکەی ئەرستۆوە هەیە کە سەلماندوویەتی : هۆنراوە تەواوکەری کەمو کوڕیەکانی جیهانە . ڕەخنەسازیە ڕیالزمە سۆشیالیزمەکانیش بەتایبەتی ئەم ڕێچکەیەیان گرتۆتە بەرو ووتویانە وێژەی ڕیالیزمی سۆشیالزم وەکو ڕیالیزمی فۆتۆگرافیو ڕیالیزمی ڕەخنەگر تابلۆی واقیعی زیندو ڕوونوس دەکاتو ڕێگای گۆڕینی ئەم واقیعە بەهۆی خەباتی چینایەتیەوە دەخاتە بەرچاوی چینە زەحمەت کێشەکان .

**ڕاستی سێیەم :**

ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە باری خوێندەواریو ڕۆشنبیری جەماوەرەوە هەیە کە لەژێر دەسەڵاتداری سەرمایەدارانو زەوت کەرانی مافی زەحمەت کێشاندا تا بڵێی دواکەوتووە ، بۆیە ڕەخنەسازە ڕیالیزمەکان بیروڕایان وایە کە وێژەی ڕاستەقینە بەخشانە(٥) نەك هۆنراوە بە هۆی تایبەتیە زمانیو ئاوازیەکانیەوە لە کێشو سەروا ناتوانێ بەڕاستی وێنەی واقیع دەربڕێ ، بەڵام پەخشان لەبەر ئەوەی بە هیچ کۆتو زنجیرێکی فۆرمی نەبەستراوەتەوە دەتوانێ ببێ بە زمانی حاڵی ژنو پیاوو لاوو پیرو خوێندەوارو نەخوێندەوارو گشت چینەکانی میللەت .

ڕێبازی ڕیالزم بە هەموو چەشنەکانیەوە بەهۆی کارتێ کردنی پەرەسەندنی زانستی پراکتیکی زیاتر لە سۆزو ئەندێشە دوورکەوتەوەو لەتەکیدا ڕێبازی سروشتی واتە ( المدرسه الطبيعيه ) بەرپابوو ، کە لە بواری هونەردا بەرهەمی وێژەیی وەکو کەرەسەیەکی ماددی لە ڕوانگەیەکی بابەتیو موضوعیەوە شیدەکاتەوەو هیچ دەرفەتێك بەڕەخنەساز نادات تۆسقاڵێك ملکەچی کەسایەتیو خودی خۆی بێت . ئەم بارەی ڕەخنەسازی لەسەر بناغەی کاروو دژکاردا .

واتە ( الفعل ورد الفعل ) بوو بە هۆی لەدایك بوونی ڕێبازی بەئانسیزم کە لەژێر تیشکی دروشمە بەناوبانگەکەیدا ( هونەر بۆ هونەر ) ناوەڕۆکی هۆنراوەی فەرامۆش کردوو گرنگی تەنیا بە فۆرم لە وێنەی هونەریو ئاوازی ووشەو دارشتنی جوان بەخشی .

ڕێبازی بە ئانسیزم کە لە کۆڕی ڕەخنەسازی ئەوروپیدا دەستەویەخە دژ بە ڕێبازی ڕیالیزمو ڕێبازی سروشتی جەنگا ، تا دەهات زیاتر گرنگی بە ووشەسازی دەدا هەتاکو بەتەواوی خۆی لە بیرۆکەو مانای هەڵبەست پچڕاندو ڕێبازی ڕەمزیو ڕێبازی سریالیزم ئەمجا ڕێبازی نائیری واتە ( مدرسة اللا معقول ) لێوەشانەوە کە هەرسێکیان پلەبەپلە مافیان بە هەستیار دا ووشەی نوێخواز بەبێ فەرهەنگو نەریتی زمانێ ساز بکاتو جڵەوی ناهۆشمەندی واتە ( اللا وعي ) بەرەڵا بکاتو بە ئارەزووی خۆی نیشانەو وێنەو دەربڕینی ئاوازی دروست بکات .

پەرەسەندنو گۆڕانی ڕێبازی بەرنانسیزم بەم جۆرە کە زەمینەی لەدایكبوونی ڕێبازی نائیریە هەرچەندە مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی ئەوروپی هۆیەکانی بە باری دەروونیو ئابووریو ڕامیاری میللەتە ئەوروپیەکان پاش شەڕی جیهانی یەکەمو شەڕی جیهانی دووەم دابین دەکەن ، بەڵام نابێ ئەوە لەیاد بکەین کە لە ڕووی مێژووەوە ڕەگو ڕیشەکانی ئەم ڕێبازانە بەندن بە ڕووکەی سۆفستایەکانەوە سەبارەت بە ئازادیو سەرفرازی هەستیار لە کۆڕی زمانی هۆنراوەدا .

ڕەخنەسازی عەرەبی دێرین کە سەرەتایی دەقە دەماودەمە گێڕاوەکانی دەگەڕێتەوە سەر دوو سەدە پێش پەیدابوونی ئاینی ئیسلام بەلای ئێمەوە بە چوارقۆناغدا تێپەڕیووە : —

**یەکەم**

قۆناغی ڕەخنەسازی عەرەبی پێش پەیدابوونی ئاینی ئیسلام کە دەقەکانی لە ڕەخنەسازی کەسیو سۆزیو ووشەیی تێناپەڕن ، هەرچەندە هەندێکیان چەشنە ڕێبازێکی بەراوردکاری دەنوێنن .

**دووەم**

قۆناغی ڕەخنەسازی عەرەبی سەردەمی پەیدابوونی ئاینی ئیسلامی پیرۆز کە نزیکەی نیوسەدە دەخایەنی .

ڕەخنەسازی عەرەبی لەم قۆناغەدا بەلای ئێمەوە نموونە ڕەسەنی و داهێنان و پەیامداری دەخاتە ڕوو . چونکە بەهۆی چەند تایبەتییەکی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر و شوێنەواری جێنشینەکانەوە ئەم ڕەخنە سازییە کەسایەتییەکی تایبەتی جیاواز لە ڕەخنەسازی ئەغریقی و ڕۆمانی بۆ خۆی چەسپاندووە کە تایبەتیە سەرەکیەکانی لەم سێ خالانەی خوارەوەدا بەرچاو دەکەون : ـ

**یەکەم**

هۆنراوە بە هۆی زانستەوە هەستیار وەدەستی دەهێنێ و هیچ پەیوەندیەکی بە ئاسمان و خوڕپە و بیلهامەوە نی یە .

**دووەم**

هەستیار بە هۆی بڕواو تێکۆشان و ڕوون بیری یەوە دەتوانێ پلەو پایەیەکی بەرز لە کۆمەلدا داگیر بکات و ئەو هەستیارەی کە بیروباوەڕی نی یەو هەموو ڕۆژێك لەسەر پەتێك یاری دەکات و کرداری لەگەل هەلبەستەکانی ناگونجێن شایانی ڕێزو نرخ پێدان نی یە .

**سێیەم**

هەستیار بەرامبەر بە کاربەدەستان لە جێبەجێ کردنی پەیامی کۆمەلدا بەرپرسیارەو بە گوێرەی ڕادەی هونەری و بەرزی ناوەڕۆکی هەلبەستەکانی پاداشتی خۆی وەردەگرێ .

**چوارەم**

قۆناغی ڕەخنەسازی عەرەبی سەردەمی پێگەیشتنی زانستەکانی زمان کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەمی کۆچی یەوە دەست پێ دەکات .

ڕەخنەسازی لەم قۆناغەدا زیاتر لەگەل فۆرمی هۆنراوەدا خەریك بوو و لەبەرتیشکی ڕێزمان و زانستی زمان و ڕەوانبێژیدا بەرهەمی هەستیارەکانی شی دەکردەوە کە بەڕاستی ئەنجام دەرەکانی دوور لە چەشەو چێژی هونەری بوون و ڕێژەیان وەکو گیانلەبەرێکی زیندوو لە قەلەم دەدا .

**پێنجەم**

قۆناغی ڕەخنەسازی سەردەمە دوا کەوتووەکان کە لە سەدەی شەشەمی کۆچیەوە دەست پێ دەکات و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کۆتایی دێ :

لەم قۆناغەدا ڕەخنەسازی عەرەبی کەوتە ژێر زەبرو زەنگی زانستی کەلام و مەنطق و وشك و ڕێژەی ڕاستەقینەی بەجێ هێشت و جلەوی خۆی دا بەدەست ڕەوانبێژی دەستکرد کە تا دەهات وشك هەلدەگەڕاو دەبوو بە دەستووری ڕووکەش دوور لە چەشەو چێژی گیانی هونەری .

ڕەخنەسازە هاوچەرخە عەرەبەکان کە زووربەیان لە سەرەتاوە بە بەرهەمەکانی ڕەخنەسازی سەردەمە دواکەوتووەکان هەولی فێرکردنیان درابوو دوایش خوێندنیان لە زانکۆ ئەورووپیەکاندا تەواو کرد ، دەستیان لە سامانی ڕەخنەسازی نەتەوایەتیان هەلگرتووە تا ڕادەیەك بە چاوی بێ کەلکی دەیان ڕوانیە هەموو کتێبێکی ڕەخنەسازی و ڕەوانبێژی عەرەبی دێرین و سکیان بو ڕێبازە ڕەخنە سازی یە ئەورووپی یەکان کردەوەو مێشك و چەشەیان بە بەرهەمەکانی ئەو ڕێبازانە زاخاودا .

سەرئەنجام لە هەلسەنگاندنی ویژەی نەتەوایەتی تازەو دێرینیان ئەو ڕێبازانەیان گرتەبەرو پێوانەکانیان بەزۆرە ملی بەسەر ویژەرە هاوزمان و هاو نیشتمانەکانیاندا سەپاندوو زاراوەی گلاسیزمی ئەورووپیان بە وشەی ( کلاسیکی ) وەرگێڕاو لە جیاتی زاراوەی ڕیالزم و ڕۆمانزم یەك بەدوای یەك زاراوەی (الواقیعیە) و (الرومانتیکیە) یان داتاشی ... هتد .

بەبێ ئەوەی ئەو ڕاستیە یادەبکەنەوە کە دەلێ · ئەم ڕێبازە ڕەخنەسازی یە ئەورووپی یانە لە لەشارستانیەتی و ڕۆشنبیری نەتەوەی ئەغریقەوە سەریان دەرهێناوەو بە ئاووهەوای باری ڕامیاری و کۆمەلایەتی و دەروونی میللەتە ئەورووپی یەکان نەش و نمایان کردووە کە لە هەموو ڕووەیەکەوە لە نەتەوەکەیان جیاوازن .

مێژوو گەر بیەوێ سەرەتایەکی زانستی بۆ ڕەخنەسازی کوردی دابمەزرێنێ ( پاش ئەوەی لەمەوبەر دووپاتمان کردەوە کە هیچ کتێب و وتارێك لەم ڕووەوە بەدەستمان نەگەیشتووە ) ·

هەردەبێ فەرامۆشی ئەو هەولدانە بکات کە ویستوویەتی دێڕەکانی پێشەکی یەکەی مەم و زینی ( احمدی خانی ) بەو سەرەتایە لە قەلەم بدات . چونکە ئەم دێڕە هۆنراوانەو دەیان دێڕە هۆنراوەی وا لە دیوانی هەستیارە دێرینەکاندا بە پێوانەی پێناسەی کۆن و تازەی ڕەخنەسازی بەکاری ڕەخنەسازی نائەژمێررێن ·

هۆی ئەم ڕاستیەیش لەلای پسپوڕان و شارەزایاندا ئەوەندە ئاشکراو بەلکە ئەویستە پێی ناوێ لێرەدا یەکلای بکەینەوەو بیسەلمێنین ·

سەرەڕای ئەم ڕاستیە ئێمە لە توێژینەوەیەکماندا ڕامانوابوو کە ئەو دێرە هۆنراوانە ڕەنگە چەند بنەرەتیەکی ڕەوان بێژیو ڕەخنەسازی بە ڕێگایەکی ناڕاستەوخۆوە بنوێنن ، کە لە ژینگەی هەستیارە خاوەن ئەو دێرە هۆنراوانەدا چەسپا بووبێتن و نوێنەرایەتی چێژی ویژەی خەلکیان کردبێ ·

سەرئەنجام لێرەدا پێویستە بەلگە ئەویستێك دەربارەی سروشتو پێناسەی ڕەخنەسازی دووپات بکەینەوە کە دەلێ : ـ

ڕەخنەسازی بە پەخشان دەنووسرێتەوەو ڕێبازە زانستی یەکەی لەسەر بناغەی شی کردنەوەو بەراووردکاریو هۆ خستنە ڕوودا دامەزراوە . کەوابوو ئێمە ڕوو دەکەینە گۆڤارو ڕۆژنامە دێرینە کوردیەکان بە هیوای وەدەست هێنانی هەنگاوی سەرەتایی ڕەخنەسازی کوردیی بە دەستکەیشتومان ·

ئەوەی جێگای شادمانی یە ئەم گۆڤارو ڕۆژنامانە درێغی ناکەنو دەیان ووتارو لێکۆلینەوەو تێبینی چەسپاندنو گفتوگۆی ویژەییمان پێشکەش دەکەن ·

ئامانجی ئەم لێکۆلینەوەیە جونکە نوسینەوەی مێژووی ڕەخنەسازی کوردی نی یە تەنیا پەنجە بۆ ئەو بەرهەمانە درێژ دەکاتو لە پێناوی مەبەستە سەرەکیەکەیدا کە باسکردنی دیاردەی لاسایی کردنەوەو ڕووکەی ڕەسەنی یە بە سەر دوو کۆمەلدا دابەشیان دەکات : ـ

**یەکەم**

کۆمەلی بەرهەمی نووسەرە ڕۆشنبیرە گشتی یەکان کۆنترین مێژووی ئەم بەرهەمانە لە تەمەنی سالێ یەکەمی ڕۆژنامەی ژیانەوە دەست پێ دەکات واتە سالێ (١٩٢٦ز) هەزارو نۆسەدو بیستو شەشی زایندراو هەتاکو ئەمڕۆ درێژە بە خۆی دەدات .

توێژەر لەم بەرهەمە ڕەخنەسازیانە بە ڕوونی تێبینی دەکات کە نووسەرەکانیان لە ڕوانگەیەکی گشتی یەوە چەمکی ویژەی هاوچەرخیان وەرگرتووەو لابەلا چەند پێوانەیەکی ڕەخنەسازیان وەچنگ هێناوەو بە بۆنەیەکەوە کردوویانە بە کوردی ·

تایبەتی یە گشتی یەکانی ئەم کردن بەکوردی یە لەم خالانەی خوارەوەدا بەرچاو دەکەون : ـ

**یەکەم**

نووسەرەکانیان راستەوخۆ خۆیان نابەستن بە هیچ سەرچاوەیەکی ڕەخنەسازی پسپۆڕەوە ، بەلکو ناڕاستەوخۆ چەند بابەتێکی ویژەییو ڕەخنەسازی یان خوێندۆتەوە بەگوێرەی توانایان لێی تێکەیشتوونو بە ... ازی خۆیان دەریانبڕیوە ·

**دووەم**

ئەو نووسەرانە لە چەسپاندنی خوێندەوەکانیاندا هیچ ڕێبازێکی دابینکراویان نی یەو بەپلان شت نانووسنەوە ·

**سێیەم**

ئامانجی سەرەکی ئەو نوسەرانە یان ستایشی بەرهەمێکە یان بەرپەرچدانەوەی ووتارێکە یو چەل کردنی نوسراوێکە کەوابوو لە هیچ ڕوانگەیەکی ئایدیۆلوژی هونەری یەوە ئەو ئامانجە هەلنەقولاوەو هەولی جێبەجێ کردنی نەدراوە ·

**چوارەم**

بە پێوانەی لاسایی کردنەوەو ڕەسەنی کە لەمەوپێش پەنجەمان بۆ ڕاکێشا ئەم بەرهەمانە نەڕەخنەسازی لاسایی کەرەوەنو نەڕەخنەسازی ڕەسەنن ، بەلکو هەروەکو ووتمان کارێکی ڕۆشنبیری گشتین . هەرچەندە دەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین کە بیروڕاکانیان لە کام سەرچاوەی ڕەخنەسازی بێگانەوە بە جۆرێکی گشتیو ناڕاستەوخۆ وەرگیراون .

بۆ سەلماندنی ئەم تایبەتیانەو روونکردنەوەیان بە نموونە لەپێشەوە سەر لە ووتارەکانی ( م · ن ) دەدەین کە ڕەنگە کۆنترین بەرهەمەکانی ئەو کۆمەلە بن (م · ن)(٦) لەووتارێکیدا ویژە بە سەر دووبەشدا دابەش دەکات : ویژەی ( شەفەهی ) ، ویژەی (تحریری) ·

مەبەستی لە ( شەفەهی ) خطابەیەو مەبەستی لە ( تحریری) ووتارو چیرۆكو چەشنەکانی تری ئەدەبیاتە ئەم دابەشکردنە لە ڕوانگەی مێژووی ڕەخنەسازی جیهانی یەوە تارێکی ڕێبازی نی یە ، بەلکو ... ئامی ڕۆشنبیری یەکی گشتی یە ·

ئەگینا ئەدەبیاتی ( خطابە ) ئەگەر لە سووچی شەفەوی یەوە باس بکرێ مەبەست بەکالا کردنەوەی تواناکانی دوێنەرە ( خطیبە ) · جگە لەمە ( خطابە ) وەکو چەشنەکانی تری ویژە دەنووسرێتەوە بە تحریری بلاودەبێتەوە . هەمان نووسەر لە ووتارێکی تردا باس لە جوانی ئەدەبیاتو شوێنەواری لە دەروونی خوێنەردا دەکاتو بە دەربڕینی خۆی دەلێ :

ئەساسی أدبیات جوانییە یەعنی نیاسێکی جوان بزێ بە مەعنایەکو اساسی منطیقیش ڕاستیە .

لە تالیف ئەدەرێکی ئەدەبیداو ئەو نقطەیەی کە لازمە دیقەتی لێبکرێ لە ڕوحدا تحصیلی هەیە جان بدیعیە ...... کە قصەیەك موافقی منطق بێ لازمە لە نقطەی حقیقەت تجاوز نەکرێ .

نووسەر پاش ئەوەی ( نموونەیەك لە چیرۆك دەهێنیتەوە ) . دەڵێ : ( ئەم قصەیە موافقی مەنطق و حقیقەتە بەڵام لە هیچ جیهەتێکەوە هیجانێکی بدیعی لە ڕۆحماندا حاصل ناکا (٧) لەم دەقەوە بۆمان ساغ دەبێتەوە کە نووسەرەکەی هیچ ڕێبازێکی زانستیی نەگرتۆتەبەر ، چونکە پەنجە بۆ شوێنەواری لباسی مەعنای ئەدەبیات درێژ دەکات بێگومان پەیڕەوی ڕێبازی ڕۆمانتیزم لە ڕەخنەسازی ئەورووپیدا ناکا ، کە هەروەکو لەمەوبەر بینیمان هیچ جیاوازیەك لە نێوانی فۆرم و ناوەڕۆکی تێکستی هۆنراوەیدا دابین ناکات .

هەروەها گرنگی پێدانی جوانی لەسەر بناغەی فۆرمی ئەدەبیات بڕواناکەین لە ڕێبازی بەرناسیزمی ئەورووپییەوە وەرگیرا بێت چونکە ئەم ڕێبازە مەسەلەی جوانی فۆرم تەنیا لە هۆنراوەدا یەکالا ناکاتەوە . بەڵکو هەموو چەشنەکانی ئەدەبیات دەکات بە مەیدانی لێکۆڵینەوەو چەسپاندنی دروشمی وێژە بۆ وێژە .

سەرەڕای ئەمە نازانین بۆچی ( حقیقتی معنا ) لە تێکستی وێژەییدا لە بەرپاکردنی هەیەجان و هەڵچوون بێبەش دەکات ؟!

بەلای ئێمەوە ئەم بۆچوونەی نووسەر ناکامێکی کەسییە ، هەرچەندە لە هەمان کاتدا تێبینی دەکەین نووسەرەکەمان زاراوەی واقیعی بەکارناهێنێ کە ڕەخنەسازە عەرەبە لاسایی‌کەرەوەکانی ڕەخنەسازی ئەورووپی بۆ وەرگێڕانی زاراوەی ڕیالزم دایان‌ناوە .

بەڵام لێرەدا دەبێ بپرسین ئایا نووسەر کە زاراوەی ( حقیقی ) بەکاردەهێنێ ڕاستەوخۆ ووشەی ( ڕیەل ) وەردەگێڕێ یاخود لە خۆیەوە دای‌ناوە ؟ !

ئێمە لەو باوەڕەداین کە نووسەر ڕاستەوخۆ زاراوەی ڕیالیزمی وەرنەگێڕاوە بەڵکەشمان ئەوەیە نووسەر لەگەڵ ووشەی ( حقیقی ) ووشەی ( منطقی ) بەکاردەهێنێ .

بابەتی فۆرم و ناوەڕۆکی هۆنراوە ( هەروەکو لەم کۆمەڵە بەرهەمانەی ڕەخنەسازی کوردیدا دیارە ) گرنگیەکی تایبەتی دراوەتێ .

هۆی ئەم گرنگیە لەوەوە هاتووە وێژەرە کوردەکانی سەردەمی نێوانی هەردوو جەنگی جیهانیدا هاتوونەتە دەنگ و ئەنگ و چەڵەمەکانی کۆمەڵەکەیان و وێژەی پەیامداریان نووسیوەتەوە مامۆستا ( ج ـ ب ) ڕۆژبەیانی لەبەرتیشکی بۆچوونێکی ڕۆشنبیری گشتیدا پارچە هەڵبەستێکی مامۆستا ( محمد امین بەگی جاف ) ـ ی هەڵسەنگاندووەو ووتوویەتی :

هەموو ئەیزانین لە شیعر وە ئەبێ هەر وێنەبێ لەبەرانبەری پارچەکان و لە هاوسەنگی تاو و خنجی قافیەکان و هیچی‌ترا : بەڵکو لەوە بەرزتر تواندنەوەی شیشی تەلای پاقژ و خاوێنی معنی لە بۆتەی بیرو مێشکی خاوەن هەستدا وە دارشتنیە لە قالبی ووشەو تۆلادا ، ئەنجا پێویستە کە شاعیرە بەنرخەکان ئەم قالبە بە چەشنێ دابمەزرێنن نە بێخەوش و جوان و بێخوار و خێچ بێ . بۆ ئەوەی پێویست بە مشتومال و ڕەندەو خرتەك نەبێ ٨ .

ئەم بەرهەمە ڕەخنە سازییە کە تەمەنی نزیکەی ( ٣٦ ) سی و شەش ساڵ دەبێت بە چەشنێکی تیوری بەرەنگاری پێناسەی دێرینی هۆنراوە دەکات کە هەڵبەست بە واتاو کێش و سەروا دەناسێنێ و دوو پاتی دەکاتەوە کە بەرهەمی وێژەیی دەبێ ئاکامێکی هونەری یەکگیر بێت بە هەموو ڕەگەزەکانیەوە ، ئەم سەلماندنە بەلای ئێمەوە جێگای ڕێز لێ‌گرتنە چونکە لەو تەمەنە زووەی ڕەخنەسازی کوردیدا توانیویەتی بیروڕای چەسپێنێ . هەرچەندە شی‌کردنەوەی هەڵبەستەکە چەند دێرێکی لە سووچی ڕێزمانەوە گرتۆتەوە .

کێشەی ئەم کۆمەڵە بەرهەمانەی ڕەخنەسازی کوردی بە زۆری لەوەدا دابین دەکرێ کە نووسەرەکانیان ڕاستەوخۆ لە سەرچاوەی ڕەسەنەوە بیروڕا ڕەخنەسازیەکانیان وەرنەگرتووە . سەرەڕای ئەوەی هەندێکیان بە هەڵە وەریان‌گێڕاوەتە سەرزمانی کوردی . نموونەمان بۆ سەلماندنی ئەم کێشەیە وەرگێڕانێکی وتارێکی ( دکتور یوسف هیکل ) ە دەربارەی ( النقد الذاتی ) و ( النقد الموضوعی ) کە لەلایەن مامۆستا ( أ ـ ب ) هەورییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی .

مەسەلەی دەستنیشان‌کردنی ڕێبازی خودی و زاتی و ڕێبازی بابەتی و موضوعی لە ڕەخنەسازیدا کارێکی ئەورووپییە مامۆستا (ا ـ ب) هەوری ڕاستەوخۆ لە زمانێکی ئەورووپییەوە وەری‌نەگێڕاوە ، هەروەها لە وەرگێڕانەکەیدا کە زاراوەی موضوعي بە ووشەی ( جێگەیی )(٩) وەرگێڕاوە هەڵەی کردووە . چونکە

واژەی موضوع لە زمانی عەرەبیدا ووشەی (موضیع) نی یە بۆ ئەوەی بە ووشەی جێگای کوردی وەربگیری ئەم مەسەلە ڕەخنەسازی یە بۆ سەر زمانی کوردی لەو کاتەدا نرخی نەبووە . بەڵکو بە پێچەوانەوە نرخێکی بەرزی هەبووەو دەنگ دانەوەی پێویستی یەك بووە . چونکە لەم کۆمەڵە بەرهەمە ڕەخنەسازی یە کوردی یەدا ووتارگەلێکی ڕەخنەسازی کەسی بەبێ ڕێبازو دوور لە زانستی بەرچاو دەکەون · بۆ نموونە سەرنج بـدە ووتارێکی مامۆستا ڕەمزی قەزاز ڕادەکێشین کە وەڵامی ووتارێکی ڕەخنەسازیی بە سوودی مامۆستا ( جیم ) دەداتەوەو بەرگری لە مامۆستا ڕەفیق حلمی دەکاتەو دەڵێ : (١٠) خۆم لەگەڵ خۆما بڕیام دا کە بە چەند دێرێکی کورت بەربەرەکانی ( جیم ) بکەم ( ج ) هەروەکو تێگەیشتووەو بۆم دەرکەوت لە نووسینەکەتا کە سەرنجی مامۆستا رفیق حلمی بەگ وەرنەگیری بۆ نووسینی بابەتی شاعیرەکانمان لە لاوانی کورد دا ئەتەوێ بڵێی کورد شاعیری نی یە جگە لەمەش ئەتەوی بڵێی کورد ئەدیبی نیە ( جا ئەگەر وانیە تکایە بفەرموو وانیە ) ؟ !

هەمووبان مامۆستا رفیق حلمی زۆرباش ئەناسین لە دەریای ئەدەبیاتا شارەزای مەلەوانی بووینو ئەزانین کە یەکێکە لە مەلەوانە بەناوبانگەکانمان لەم دەریا بێ بنەدا لەم سەدەی بیستەمەدا ) ·

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە ڕەخنەسازەکەمان بەربەرەکانی دەکاتو ڕەخنەسازی نانووسێتەوەو لە ڕوانگەیەکی کەسی یەوە ستایشی دەکاتو بەپرسیاری دوور لە شی کردنەوەو هەڵسەنگاندن بیروڕاکانی مامۆستا ( جیم ) پوچەڵ دەکاتەوە ·

هەرچۆنێك بێت بەرهەمی ڕەخنەسازی کوردی کە بەو تایبەتیانە لێشاو دەهێنن هەتاکو ئەمڕۆ زوربەی لاپەڕەی گۆڤارو ڕۆژنامەکانمان داگیر دەکەن ، تەنانەت هەندێ جاریش دەگرێن بە کتێبو نامیلکەو بەناو خەڵکدا بڵاوەدە کرێنەوەو نائۆقرەی و ناڕێبازی بەخش دەکەنەوە ·

## دووەم

کۆمەڵی بەرهەمی ڕەخنەسازی پسپۆڕ : ـ ئەم کۆمەڵە بەرهەمە ڕەخنەسازی یە لە دەورو بەری ساڵی (١٩٥٨ ز) هەزارو نۆسەدو پەنجاو هەشتی زاینی یەوە بە چەشنێکی فراوان بەرچاو دەکەون کە خاوەن شەهادەت نامەی پسپۆڕو مامۆستای خاوەن تاقی کردنەوە نووسیویانەتەوە ·

تایبەتی گشتی ئەم کۆمەڵە بەرهەمانە لە دوو خاڵدا خۆیان دەنوێنن : ـ

## یەکەم

لاسایی کردنەوە بە ڕێگای وەرگێرانەوە بەبێ ئەوەی دانەرەکانیان بڵێن ئەمە وەرگێرانە ·

## دووەم

ـ سەپاندنی بڕیارو پێوانەی ناگونجاو لەگەڵ سروشتی وێژەی نەتەوایەتیمانداو بەکارهێنانی زاراوەی بێگانە دوور لە مەبەستو واتاکانیانەوە ·
ئەگەر بمانەوێ گەشتێکی کورت لەگەڵ ئەم کۆمەڵە بەرهەمە ڕەخنەسازی یە کوردی یانەدا بکەین بۆ چەسپاندنی تایبەتیەکان باشتر ئەوەیە بە لاسایی کردنەوەی ڕەوان بێژی عەرەبی دەست پێ بکەین، چونکە ڕەوانبێژی عەرەبی لەم ڕۆژانەدا لەبەر تیشکی ڕێبازێکی زانستی بەرهەمە ڕەسەنەکانی بوژێنراوەتەوەو ڕێچکەی لێکۆڵینەوەی داهێنراوی گرتۆتە بەر . هەروەکو لە کتێبەکانی (دکتور جمیل سعید) و (دکتور احمد مطلوب) و (احمد فؤاد الشایب) دا دەردەکەوێ کەچی ئەوانەی بە زمانی کوردی کتێبی ڕەوانبێژیان داناوە دەستیان بۆ کتێبە ڕەوان بێژی یە عەرەبییەکانی سەردەمە دوا کەووتوەکان درێژکردووەو بەزۆرەملی بنەواشە ( منطقی )و ووشەیی یەکانیان بەسەر وێژەی کوردیدا سەپاندووە .

پرسیاریش لێرەدا بەسەر سوڕمانێکەوە دەپرسێ : بۆچی ئەم دانەرە کوردانە سوودیان لە ڕەوانبێژی عەرەبی ڕەسەن وەرنەگرتووەو لە تاقی کردنەوەی ئەم ڕەخنەسازی یە لە قۆناغە خەملاوو پێش کەوتووەکاندا تاقی کردنەوەیان وەدەست نەهێناوە ؟!

هەڵبەت هیچ وەڵامێك دەربارەی ئەم پرسیارانە نی یە ، ئەوە نەبێ کە دەڵێ : ئەم دانەرە کوردانە بۆیە خۆیان بەو چەشنە کتێبە ڕەوانبێژی یە عەرەبیانەوە بەستۆتەوە . چونکە پسپۆری یەگەیان ئەکادیمی و زانکویی نەبووە ؛ بەڵام یان لە مزگەوتو حوجرەو یان بە هۆی خوێندنەوەیەکی کەسی یەوە چەشنێك لە پسپۆڕیان لە بابەتی ڕەوانبێژیدا پێك هێناوە .

جا بۆ ئەوەی لەم ڕاستی یە بکەینو بزانین شوێنەواریان چلۆنە هەندێ نموونە دەهێنینەوە ·

مامۆستا :ـ عەزیز گەردی ـ هەروەکو بزانین ـ یەکەم نووسەری کوردە کە کتێبێکی کوردی لە بابەتی ڕەوان بێژیدا داناوە هەر چەندە بەر لەو مامۆستا علاء الدین السجادی بە پوختەیی ئەم باسەی

کۆلیوەتەوەو(١١) زۆربەی زاراوەکانی چەسپاندووە .

مامۆستای ناوبراو لە پێشەکی(١٢) کتێبی یەکەمی کارەکەیدا دانی بە ڕێبازە لاسایی کەرەوەکەیدا ناوەو سەرنجمانی بۆ سەرچاوە ڕاستەقینەکانی ڕاکێشاوەو سروشتی نیشەکەی خستۆتە ڕوو وتوویەتی : ( لەو کتێبانەی ئەمخوێندنەوە زیاتر حەزم لە کتێبی ڕەوانبێژی ئەکرد ئەوەشمان لە بیر نەچێ لەگەڵ خوێندنەوەی هەرکتێبێکیا تێبینیو سەرقەڵەمی تایبەتیم ئەنووسیەوە ..... لە هەمان کاتیشا شاڵاوم بۆ دیوانو گۆڤارو ڕۆژنامەکانی کوردی برد بۆ دۆزینەوەی نموونەی تەواوو زیندوو بۆ هەریەکێ لە پێشە ڕەوانبێژییەکان ..... بۆ سەرچاوەکان ناچار بووم هێنز بدەمە سەرچاوەکانی عەرەبی خۆ ڕەوانبێژیش لە هەموو نەدەبێکا ، واتە ئەدەبی هەموو میللەتێکا هەر یەکە ئەوەندە هەیە زمانی نووسینەوەو نموونەکان ئەگۆڕێنو بەس ! ئەگینا گەوهەری زانیارییەکە هەموو هەریەکەو وەك هەر زانیارییەکی تر سەرچاوەکەی بۆ لای یۆنانەکان ئەچێتەوە) .... ڕەوانبێژی کوردی وەکو ڕەوانبێژی هەر زمانێکی تر ئەکرێ بە سێ بەشەوە :- ڕەوانبێژی - البيان - واتا شناسی - المعانی - جوانکاری - البديع - ) .

لەبەر تیشکی ئەم دەقەدا ئاشکرایە کە مامۆستا عەزیز گەردی زیاتر لە وەرگێرانی چەند کتێبێکی ڕەوانبێژی عەرەبی سەردەمە دواکەووتووەکانو هێنانی نموونە لە وێژەی کوردی هیچی تری نەکردووە . هەرچەندە لە سەرچاوەکانیدا ناوی کتێبی ڕەوانبێژی سەردەمی پەرەسەندنو خەملاندنی ڕەخنەسازی عەرەبی بردووەو ناوی کتێبی هاو چەرخی لە وێژەی بەراوورد کاریو ڕەخنەسازی زانستیشدا تۆمار کردووە .

بەڵگەی سەلماندنی ئەم بڕیارەمان ئەوەیە تەنیا کتێبە ڕەوانبێژە عەرەبییەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی بەرەوژوور ڕەوانبێژی بەسەر - علم المعانی - و - علم البيان - و - علم البديع - دا دابەش دەکەن.

جگە لەمەش مامۆستا گەردی بە هەڵەدا چووە کە وتوویەتی یۆنان سەرچاوەی هەموو لێکۆڵینەوەیەکی ڕەوانبێژییە هەروەها لە ڕاستییەوە دوورە کە وتوویەتی لە ڕەوانبێژی میللەتاندا تەنیا نموونەکان دەگۆڕێن .

بە ڕاستی ئامانەوێ لێرەدا هۆی ئەم بۆ چوونە هەڵانە باس نەکەین ، بەڵام خۆمان دەبەستین بە ئامانجی لێکۆڵینەوەکەمانو سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین کە ڕێبازی ڕاستەقینەی ڕەوانبێژی عەرەبی لە ڕێبازی ڕەوانبێژی یونانییەوە نامانێ ڕێمانە :- ڕێبازی ڕاستەقینەی ڕەوانبێژی عەرەبی ڕێبازێکی ( استقرائی ) یە پشت بە چاو پێخشاندنی هەموو نموونە بەرزەکانی وێژە دەبەستێ ئەمجا دەست دەکات بە شیکردنەوەی ئەو نموونانەو بنەواشە دەچەسپێنێ .

بەڵام ڕێبازی ئەغریقی ( یونانی ) بە تایبەتی لەسەر دەستی ئەرستودا ڕێچکەیەکی لۆجیکیو فەلسەفیەو چاو دەبڕێتە دەستووری مەنطقیو بە هۆی ئەم دەستوورانەوە نموونەکان بەبێ شیکردنەوە دەهێنێتەوە ئەمە لە سەردەمی دێریندا ، بەڵام لە سەردەمی هاوچەرخماندا ڕێبازەکانی شیکردنەوەی نموونەی ڕەوانبێژیو زمانی هونەریو وێنەی ئەندێشەیی تابڵێی زۆروو بەپێی دانەری پسپۆڕ دەتوانێ لێیان بکۆڵێتەوەو بە گوێرەی سروشتی زمانەکەی ڕێبازێك هەڵبژێرێو دەستکاری بکاتو لەگەڵ ئامانجی لێکۆڵینەوەکەیدا بیگونجێنێ .

پراکتیکمان بۆ ئەم بارە با نیشارەتێك بێت بۆ بەشەکانی ڕەوانبێژی کە بەر لە ئێمە بەلێکچواندنو خوازەو خواستنو درکە دانراونو ڕووکەشانە پێناسە کراونو نموونەیان بۆ هێناوەتەوە .

بەڵام ئێمە لە کتێبێکماندا بەناونیشانی ( زانستی(١٣) ئاوەڵواتا ) نە لە ڕووی زاراوەو نە لە ڕووی ڕێبازەوە وامان نەکردووە .

لە ڕووی زاراوەوە تەنیا زاراوەی ئاوەڵواتامان بەکارهێناوەو چوار زاراوەکەی دیمان فەرامۆش کردووە .

لە ڕووی ڕێبازەوە ئاوەڵواتامان بە زمانی ئەندێشە داناوەو لە کۆڕی زمانو هونەردا شیمان کردۆتەوەو سەلماندوومانە کە ئەم دیاردەیە لە وێژەی کوردیدا تا ڕادەیەکی زۆر بارێکی تایبەتی هەیە دوابەدوای مامۆستا عەزیز گەردی مامۆستا علاء الدين سجادی لە هەمان کۆڕدا کتێبێکی پسپۆڕو سەربەخۆ بە ناونیشانی خۆشخوانی داناوە .

کە دووبارە ئاکامی لاساییکردنەوەی کتێبی ڕەوانبێژی عەرەبیی سەردەمە دوواکەوتووەکانە چ لە ڕووی زاراوەو راڤە کردنو چ لە ڕووی ڕێبازەوە .

بۆ بەڵگە مامۆستا علاء الدین سجادی زاراوەی ( الجناس ) کە لە ڕەوانبێژی عەرەبیدا بەشێکە لە بەشەکانی زانستی ( البدیع ) لقی (المحسنات اللفظیة) بە ووشەی ( ڕەگەزدۆزی ) وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردیو پێناسەی کردووەو ووتوویەتی: (ڕەگەزدۆزی، کە ( جناس ) ە لە عەرەبیدا · بۆیەش کوردیەکە وای بۆ داناوە ، چونکە ڕەگەز بە مەعنا ئەسڵو نەژادە ، ( دۆزی ) لە دۆزینەوەوە هاتووە · وای لێدێتەوە کە پێکەوە گونجانو دۆستایەتی ڕەگەزی دوو ووشە پێکەوە ئەدۆزێتەوەو پەیدای ئەکەی )(١٤) ·

ئەم پێناسەیە ـ هەروەکو دیارە ـ باسی هێنانی دوو ووشەی هاودەنگو واتا جیاواز لە تێکستێکی وێژەییدا دەکات ، زاراوەکەی ( ڕەگەزدۆزی ) ووشەیەکی لێکدراوە لە ( ڕەگەز ) و لە (دۆزی) : ووشەی ڕەگەز کە وەرگێڕانێکی ووشە بە ووشەی ( الجنس ) ی عەرەبییە هیچ پەیوەندیەکی واتای ڕاستەوخۆی بە ووشەی ( الجناس ) ی عەرەبییەوە نییە . چونکە ووشەی ( الجناس ) لەم بابەتەدا بە مانای (المشابهة) و (المماثلة) هاتووە نەك بە مەبەستی بەشداری بوون لە ڕەگەزدا ·

هەروەها ووشەی ( دۆزی ) یش هیچ پەیوەندیەکی بە ( الجناس ) ی عەرەبییەوە نییە ·

جگە لەمە مامۆستا علاء الدین کە بابەتی ( الجناس اناقص ) ی عەرەبی وەردەگێڕێ هەوڵی ئەوە ئەدات کە بەرگێکی کوردی بکات بە بەریداو بۆیە دەڵێ : ( ئەگەر لە کێشو ژمارەی پیتدا شکلاً وەکو یەك وابوون بەڵام لە سەرو بۆردا جیابوونەوە ئەمە بە ڕەگەزدۆزی «لادەر» واتە «منحرف» ناو ئەبری (١٥) . گومان لەوەدا نییە کە لە زمانی کوردیدا سەرو بۆر واتە ( الضمه ، الکسرة ، الفتحه ) نییەو ئەم دەنگانە لە کۆتایی ووشەی عەرەبی لە ڕستەدا بۆ مەبەستی واتای بەکار دەهێنرێن کە پێیان دەووترێ ( حرکات الاعراب ) و لە دارشتەی ووشەشدا دەنگی بزوێنن ·

سەر ئەنجام ئێمە لێرەدا دەتوانین دووپاتی بکەینەوە کە مامۆستا علاء الدین سجادی بە چەشنێکی میکانیکی لاسایی چەند کتێبێکی ڕەوانبێژی عەرەبی دەکاتەوەو هیچ کۆششێکی ڕەسەنی نەکردووە بۆ سوود وەرگرتن لە کتێبە بە پیتەکانی ئەم ڕەوانبێژییە ئەمجا گونجاندنی ئەو سوود وەرگرتنە لەگەڵ سروشتی زمانو وێژەی کوردیدا ·

سەرەڕای ئەم تێبینییانە دەربارەی بابەتی (الجناس) کە ئێمە ڕامان وایە بە زاراوەی (هاودەنگی) بکرێت بە کوردی لە ڕەوانبێژی ڕەسەندا پەیوەندی بە سۆزو هەڵچوونی وێژەرەوە هەیەو توێژەری ڕاستەقینە وەکو سەرچاوەیەك لەسەر چارەکانی ئاوازی ناو خۆی تێکستی وێژەیی شیی دەکاتەوە .

ڕەخنەسازی(١٦) ڕەسەنی کوردی بەلای ئێمەوە کە باسی زانستەکانی ڕەوانبێژی دەکات پاش ئەوەی دان بە پێویستی لێکۆڵینەوەی ئەم زانستانە وەکو سامانێکی دێرین دەنێت ، دەبێ ئاکامەکانی ئەم زانستانە لە دوو کۆڕدا باس بکات :ـ

**یەکەم :**

کۆڕی وێنەی هونەری کە ز ی ئەندێشەیە لە لێكچوواندنو ئاوەڵواتای ووشەو ... دەربڕین پێکهاتوون ·

**دووەم :**

کۆڕی ئاوازی ناوخۆی تێکستی وێژەیی کە باس کردن لە ووشەی هاودەنگو ووشەی واتا دژیەكو دەنگی پێکهێنانی واژە لە کۆنسینەنتو بزوێن دەگرێتە خۆی ·

مێژووی ڕەخنەسازی کوردی لە ڕوانگەی پسپۆڕیو ڕەسەنییەوە لە لێکۆڵینەوەی ڕەسەن بێبەش نییە ، بەڵگەمان بۆ چەسپاندنی ئەم بیروڕایە کۆمەڵە ووتارێکە(١٧) چلو هەشت ساڵ لەمەوبەر لەلایەن ڕەخنە سازێکی کوردەوە بە ناوی ( سیاپۆش ) بڵاوکراونەتەوە .

ئەم ڕەخنەسازە لە سەرەتای بەشی یەکەمی ووتارەکەیدا پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە نەتەوەی کورد لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا جگە لە ستایشو دۆستایەتیو برایەتی سەبارەت بە هەستیارەکانمان هیچیتریان نەبووە ، بۆیە بڕیارێك سازدەکاتو دەڵێ : ( بەڵام لەمەو دوا ئەو دەورە ڕۆی کە بە ( زەرد بووتری زێڕ ) وە بە ( صەدەف بڵێ مرواری ) لەمەودوا ڕۆشنایی زانستی بەرچاومان ڕوونــاك ئەکاتەوە ، هەموو شتێك وەك خۆی ئەبینین (١٨) .

زاراوەی زانست لەم تێکستە ڕەخنەسازییەدا بە ڕاستی سەرنجی نووسەری مێژووی ڕەخنەسازی کوردی ڕادەکێشێتو دەیخاتە باری چاوەڕێ کردنی بیستنی زاراوەی بێگانەو خوێندنەوەی ئاکامی یەکێك یان پتر لەو ڕێبازە ڕەخنەسازییە ئەوروپیانە کە بەر لە سەدەی بیستەم بە دوو سەدە لە دایكبوون

حەملانەو خۆیان گەیاندە زمانی فارسیو توورکیو عەرەبی کە مامۆستا سیاپۆش هیچ نەبێ یەکێکیان زیاتر لەو زمانانەی زانیووە ٠

بەڵام ئەو چاوەڕێ کردنە سەرئەنجامی ئەوە نادات بەدەستەوە ، بەڵکو هەر ئەوە ڕوون دەکاتە کە ڕەخنەسازی ناوبراو پلاتو ڕێبازێکی زانستی لە پێناسەی هۆنراوو هەڵسەنگاندنی هەستیارانی کورددا دەگرێتە بەرو بەبێ ئەوەی هیچ پێوانەیەکی ناکوردیو زاراوەیەکی بێگانە بەکار بهێنێ ، بۆ بەڵگە ما بەدوای زاراوەی ڕیالیزمو شوێنەواری ڕێبازی واقیعەت لە دووتوێی پێناسە جۆر بە جۆرەکانی ئەم ڕەخنەسازەدا دەربارەی هۆنراو ئەرکی هەستیارو سەرچاوەی هەڵبەستی ڕاستەقینەی کوردی بگەڕێنن : ــ

ناوبراو لەم ڕووەوە وتوویەتی : « شیعر تەرجمانی دڵە ... چ بە دڵا بێت ئێشو ئازارو دەردو خەفەت ، هیواو نائومێدی ، گومانو باوەڕ ، ترسو بێباکی خراپیو چاکیمان بە کەلیماتی ڕێکو پێک لە شێوەیەکی دڵگیردابۆ دەردەخات کەهەموو کەس لە ئانی خوێندنەوەیدا شێوەیەکی دڵی خۆی تیادەبینێت ، شیعر چرایەکە تاریکی ڕێی ژیانمان بۆ ڕۆشنو یارمەتیمان ئەدات لە دۆزینەوەی حەقیقەتا » ٠

.... ( شیعر وێنەیەکی ژیانە لە حەقیقەتێ ئەزەلیەوە وەرگیراوە ئاوێنەیەکە ناشیرینی تیا جوان ئەبینرێ... مەنظومەیەکی درێژە سەرچاوەیەکە تا ئەبەد جوانیو حیکمەتی لێ هەڵئەقوڵێ ٠ شیعر پەچە لە ڕووی جوانیەکی پەنهان لائەدا )(١٩) ٠

لەم تێکستەدا ئاشکرایە کە مامۆستا سیاپۆش وەکو مامۆستا ( م ٠ ن ) زاراوەی حەقیقەت بەکاردەهێنێو زاراوەی ڕیالیزمو واقیعیەت پشتگوێ دەخات ٠

هەروەها ئەرکی هۆنراوەی حەقیقی بە کارێکی میکانیکیو ڕنووس کردن نازانێت ، بەڵکو بە ئاکامێکی ڕاستەقینەی پەیامدار لە قەڵەم دەدات ٠ پرسیاریش دیسانەوە بۆ دڵنیای ئەوەیە ئایا ئەم بۆ چوونەی ڕەخنە سازەکەمان لاسایی کردنەوەیەکی ڕێبازی ڕیالیزمی سۆشیالیستیو ڕێبازی بەرناسیزمو ڕێبازی ڕۆمانزمی ئەورووپییە ؟ ! یان کارێکی خوڵقێنراوو ڕەسەنە ؟ !

بەرپاکەری ئەم پرسیارە ڕەنگە تێبینی بکات کە هەندێك لە چەمەکەکانی ئەو ڕێبازە ئەورووپیانە لە بۆ چوونەکەی ڕەخنەسازی ناوبراودا ڕەنگیان داوەتەوە ، بەتایبەتی سێ بابەتی ڕەخنەسازی ئەورووپی گرنك کە ئەمانەی خوارەوەن : ــ

**یەکەم**

بابەتی پێناسەی هۆنراو بە ( تەرجمانی دڵ ) کە بناغەی ڕێبازی ڕۆمانزمی ئەورووپییە لە دەست نیشان کردنی سەرچاوەی ئەم هونەرەدا ٠

**دووەم**

بابەتی سنوور دانانی ئەرکو پەیامداری هۆنراوە بە چرایەك ( شیعر چرایەکە تاریکی ڕێی ژیانمان بۆ ڕۆشنو یارمەتیمان ئەدات لە دۆزینەوەی حەقیقەتا) کە دروشمی سەرەکی ڕێبازی ڕیالزمی سۆشیالزمییە٠

**سێیەم**

بابەتی دەست نیشان کردنی سەرچاوەی هۆنراوە بە پەچە لادان لەسەر پەنهان کە تێڕوانینێکی گرنگە لە تێڕوانینەکانی ڕێبازی بەرنانسزم ٠

هەروەها ئێمەش لەگەڵ بەرپاکەری ئەو پرسیارەدا تێبینی دەکەین کە مامۆستا سیاپۆش وتەی هەستیاری ئینگلیزی بەناوبانگ شیلی دەهێنێتەوە کە باس لە ئەرکی هۆنراو دەکاتو دەڵێ

**( شیعر لە شەوانی لەیەك بواندا فوو لە کورەی دڵداری ئەکا ، لە ڕێگای ژیاندا چرای هیوا بۆ تێکۆشەران هەڵئەگیرسێنێ )(٢٠) ٠**

ئەم دوو تێبینیە ڕەنگە ڕووکەشانە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوەو دووپاتی بکەنەوە کە ڕەخنە سازەکەمان بەر لە نزیکەی پەنجا ساڵ لاسایی ڕەخنەسازی ئەورووپی کردۆتەوەو لە هەر ڕێبازێك لەم ڕێبازانە چەمکێکی گرتۆتە خۆیو بەبێ گونجاندن ملی هەستیارە کوردەکانی گرتووەوەو ئەو چەمەکانەی بە سەریاندا سەپاندووە ٠

بەڵام ئەوەی بە قووڵی بڕوانێتە بۆچوونەکەی مامۆستا سیاپۆش تێدەگات کە ئەم ڕەخنە سازە کوردە دژی لاسایی کردنەوە بووە ، بەڵگەشمان بۆ چەسپاندنی ئەم بیروڕایە لەوەوە هاتووە :

ڕەخنەسازی ناوبراو بە توندی پێناسە دێرینەکەی هۆنراو کە دەڵێ :

( شیعر وتنێکی وەزندارو قافیەدارە) (٢١) ٠

دەیداتە بەر نەشتەری پووچەڵ کردنەوەو دەڵێ : (بەڵام ئەبێ بزانین کە کەلیمات لەشو مەعنا گیانیەتی لە کەلیمەی ڕێکو پێکو مەعنایەکی بەرزو بڵندشیعر پەیدا ئەبێ )(٢٢) ٠

ئەم هەڵوێستەی مامۆستا سیاپۆش هەروەکو

شارەزاکانی مێژووی ڕەخنەسازی نەتەوەی عەرەبو نەتەوە موسلمانەکان دەزانن هیچ سەرچاوەیەکی ئەوروپی نی‌یە . بەڵکو بەرامبەر بە هەڵوێستی – ۳۳۷ – کۆچی بنیات‌نراوە کە لاسایی‌کەرەوەی ڕەخنەسازی ئەغریقی‌یە بە گشتی‌و شاگردی ( ئەرستو )ی یونانی‌یە بە تایبەتی .

هەرچونێك بێت ئەم هەڵوێستەی مامۆستا سیاپۆش لە ڕەخنەسازی کوردی‌دا بەلای ئێمەوە نموونەی ڕەخنەسازی ڕەسەنی کوردی‌یە کە بەداخەوە بە چەشنێکی فراوان شەوقی نەداوەو نەبووە بە ڕێبازێکی بناغە چەسپاوو خاوەن پەیڕەوی‌کەر .

بۆیە وورده وورده لە یادکراوەو لە بیرچووە ئەمجا لە شوێنیدا ڕەخنەسازی بە زمانی کوردی کە لاسایی ڕەخنەسازی ئەوروپی دەکاتەوە تەشەنەی کردوو تا ڕادەیەکی زۆر باڵی بەسەر وێژەی کوردی‌دا کێشا .

دیاردەکانی ئەم لاسایی‌کردنەوەیە جۆر بەجۆرو تا ڕادەیەك ڕەگ‌و ڕیشە داکوتراون .

مێژوونووسی ڕەخنەسازی کوردی گەر بیەوێ بە کورتی ڕادەی هەڵەو ڕووکەشی‌و ناکونجاویان لەگەڵ سروشتی وێژەی کوردی‌و زانست‌و هونەری ڕەخنەسازیدا بخاتە ڕوو دەتوانێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا سەرنج بۆ گرنگترینیان ڕابکێشێ :–

## یەکەم

زوربەی ڕەخنەسازو مێژوونووسی وێژەی کوردی بۆ جیاکردنەوەی هۆنراوەی دێرینی نەتەوەکەمان لە هۆنراوەی هاوچەرخ‌و نوێخواز زاراوەی ( کلاسیکی ) بەکار دەهێنن :–

بۆ نموونە دەڵێین : ئەم هەڵبەستەی سالم بەرهەمێکی کلاسیکی‌یەو نالی‌و کوردی‌و وەفایی شاعیری کلاسیکین .

بەکارهێنانی زاراوەی کلاسیکی لەم بوارەدا لە ڕووی واتەو چەمەکی ڕەخنەسازی‌یەوە بە هیچ جۆرێك لە شوێنی خۆی نەهاتووە هەروەها لە ڕووی ووشەسازی داڕشتنەوە هەڵەیە .

لەمەوبەر بینیمان زاراوەی کلاسیزم لە ڕەخنەسازی ئەوروپی‌دا بۆ چەشنە هۆنراوەیەکی شانۆگەری سازکراوەو بەکارهاتووەو هیچ پەیوەندیەکی بە هۆنراوەی خودی‌و زاتیەوە نی‌یە ، جا کە لە هۆنراوەی دێرینی کورددا ئەو چەشنە هۆنراوە شانۆگەری‌یە نەبووبێ چلۆن دەبێ بە ووشەی کلاسیکی ناوببرێ ؟ !

سەرەڕای ئەمە کە دەزانین هیچ هەستیارێکی دێرینی کورد شانۆگەری تراجیدیەو کۆمیدیای نەهۆنیوەتەوەو پەیڕەوی پێوانەکانی ئەرستوتالیس‌و ڕەخنەسازە کلاسیزمە ئەوروپی‌یەکانی نەکردووە کە چ بنەواشەیەکی ڕەخنەسازی زانستی‌و هونەری بەرگی کلاسیزمیان دەکرێتە بەر ؟ !

وەڵامی ئەم دوو پرسیارە سەرسووڕهێنەرە بەلای هەموو پسپۆڕو شارەزایەکەوە دیارو ئاشکرایەو دووپاتی دەکاتەوە کە بەکارهێنانی زاراوەی کلاسیکی لە وێژەو ڕەخنەسازی کوردی‌دا هیچ ڕێ‌و شوێنێکی زانستی‌و هوونەری مێژوو نی‌یە . لە ڕووی ووشەسازی‌و داڕشتنەوە زاراوەی کلاسیکی بە هەڵە لە زمانی عەرەبی‌یەوە ڕەخنەسازە کوردە لاساییکەرەوەکان وەریان‌گرتووە . چونکە لە زمانی عەرەبیدا ووشەکە ( کلاسی ) یە نەك ( کلاسیکی ) بە بەڵگەی ئەوەی واژەی ( کلاس )ی لاتینی کە لە زمانی عەرەبیدا دەکرێ بە منسوب بزوێنی ( یا )ی ئەسەب ( نسب ) پێوەی دەلکێنرێ‌و بە هیچ کلۆجێك پێویستی بە کۆنسینەنتی ( ك ) نی‌یە . جا ئەگەر بڵێین زاراوەی کلاسیکی لە کتێب‌و ووتارە ڕەخنەسازی‌یە عەرەبیەکاندا بەو چەشنە هاتووە ، ئەم ووتنەش دیارە ڕاستە ، دەتوانین بڵێین ! ئەو ڕەخنە سازە کوردانە لاسایی هەڵە دەکەنەوەو دووجار هەڵەدەکەن .

## دووەم

هەندێ ڕەخنەسازو مێژوو نووسی وێژەی کوردی زاراوەی ڕیالزم‌و لقەکانی واتە ڕیالیزمی فوتۆگرافی‌و ڕیالیزمی ڕەخنەگرو ڕیالیزمی سۆشیالزم بۆ پیاهەڵدانی هۆنراوەی کۆمەڵایەتی‌و ڕامیاری پەیامداری کوردی ڕاستەوخۆ یاخود وەرگێڕانەکانیان بە ووشەی واقیعی عەرەبی بەکاردەهێنن .

ئەم بەکارهێنانە ئەگەر هاتو بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ هۆنراوەی پەیامداری کوردی هاوچەرخ‌دا پەیڕەوی کرابوو ، بێگومان تا ڕادەیەکی زۆر لە ڕووی مەبەستی ئایدیولۆژی‌و مانای ڕەخنەسازی‌یەوە دوورو بچراوە : چونکە هەروەکو لەمەوبەر ڕوونمان کردەوە ڕیالزم ڕێبازێکی ماددی‌و متریالیزمی ئەوروپی‌یە کە سەر ئەنجامی دەرفەتێکی ئابووری تایبەتی‌یەوە لە کۆڕی ئاین‌و فەلسەفەدا لەگەڵ فەلسەفەی ئایدیالیزمدا دژ یەك‌و کاردانەوەیەکە .

هەروەها ئەم زاراوەیەو لقەکانی لە ڕەخنەسازی ئەوروپی‌دا بۆ خستنە ڕووی چەشنێك لە چەشنەکانی پەخشان نەك هۆنراوە ساز دەکرێت .

هەندێ ڕەخنەسازی لای کورد لەم دوایییەدا باوەش بۆ کۆمەڵێك لە هەستیارانی کوردی گەنج دەکەنەوە کە فەرهەنگی کوردەواری و سامانی نەتەوایەتی وێنەی هونەری پشتگوێ دەخەن و بە ئارەزووی خۆیان ووشە و دەربڕینی بێ مانای فەرهەنگی و بێ واتای خوازەیی بەبیانووی ڕەمز و نیشانە دادەتاشن ·

ئەم ڕەخنەسازە کوردانە لە چەسپاندنی ئەم دیاردەیەدا لاسایی لقەکانی ڕێبازی بەرنانسیزم دەکەنەوە وەکو ڕێبازی ڕەمزی و نیشانەیی و ڕێبازی سریالیزم و ڕێبازی ناماقوڵ کە لە سورچی مێژووی ڕەخنەسازی ئەورووپییەوە درێژە پێدانێکە بۆ فەلسەفەی سۆفستاییەکان لە فەلسەفەی کۆنی ئەغریقیدا .

هەرچۆنێك بێت پاش ئەم گەشتە دوورودرێژە لەگەڵ دیاردەی لاساییکردنەوە و ڕووگەی ڕەسەنی لە ڕەخنەسازی کوردیدا دەتوانین سێ سەرئەنجامی سەرەکی بچەسپێنین :ـ

## یەکەم

دیاردەی لاسایی کردنەوە لە ڕەخنەسازی کوردیدا بە جۆرێکی سامناك تەشەنەی کردووەو تا دێت لە ڕۆشنبیری کوردیدا ڕەگ و ڕیشەی دادەکوتێ و سەرچاوەکانی جۆربەجۆر دەکات ·

## دووەم

ڕووگەی ڕەسەنی لە ڕەخنەسازی کوردیدا هەرچەندە لە مێژووی وێژەی کوردیدا بەدی کراوە بەڵام لەم ڕۆژانەدا پەیڕەوی کەرەکانی بە دەگمەن بەرچاو دەکەون و دیاردەی لاسایی کردنەوە خەریکە پێشێلی دەکات و ڕێگای خەملاندن و نەشونمای لێدەگرێ ·

## سێیەم

ڕەخنە سازی کوردی گەر بیەوێ سوود لە تاقیکردنەوەی میللەتان وەربگرێ سەرچاوەی ئەم سوود وەرگرتنە ڕەخنەسازی و ڕەوانبێژی ڕەسەنی عەرەبییە نەك ڕەخنەسازی ئەورووپی ·

## چوارەم

ڕووگەی ڕەخنەسازی ڕەسەنی کوردی بۆ ئەوەی ببوژێتەوەو پەرەبسێنێ پێویستە لەگەڵ سروشتی وێژەی کوردیدا بگونجێ و ئامانجەکانی ئەم وێژەیە دابین بکات زاراوە و ڕێبازی شیکردنەوەی خۆماڵی خۆی ساز بکات ●

### پەراوێزەکان :

(١) بڕوانە کتێبی اسس النقد الادبی الحدیث وەرگێڕانی هیفاء هاشم چاپخانەی دمشق ١٩٦٦ بەرگی یەکەم ( لاپەڕە ١٣ ) ·

(٢) بڕوانە کتێبی فن الشعر ارسطوطالیس توژینەوەی دکتور عبدالرحمن البدوی (لاپەڕە ٤٥) ·

(٣) بڕوانە کتێبی ( الادب ومذاهبە ) دکتور محمد مندور چاپی دووەم سالی (١٩٥٧) مصر ( لاپەڕە ٤٠ ) ·

(٤) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ( لاپەڕە ٥٤ ) ·

(٥) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ( لاپەڕە ٨٢ ) ·

(٦) بڕوانە ڕۆژنامەی ژیان سالی یەکەم ژمارە (٢٣) ڕۆژی (٨) تموز ١٩٢٦ (لاپەڕە ٣) ·

(٧) بڕوانە ڕۆژنامەی ژیان ژمارە (٢٤) سالی ١٩٢٦ ڕۆژی (١٥) تموز لاپەڕە (١) ·

(٨) بڕوانە گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٣) سالی ١٩٤٤ (٥) مارت لاپەڕە (٥١) ·

(٩) بڕوانە گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (١٠) سالی ١٩٤٤ (٥) تشرینی یەکەم (لاپەڕە ٥٧) ·

(١٠) بڕوانە گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٣) — (٥) مارت سالی ١٩٤٤ (لاپەڕە ٥٣) ·

(١١) بڕوانە کتێبی ئەدەبی کوردی لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردیدا ··· علاء الدین السجادی ·

(١٢) بڕوانە کتێبی ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا بەرگی یەکەم ١٩٧٢ نووسینی عەزیز گەردی (لاپەڕە ٦ـ٧) ·

(١٣) ئەم کتێبە ئامادەکراوە بۆ لە چاپدان ·

(١٤) بڕوانە کتێبی خوشخوانی نووسینی مامۆستا علاء الدین السجادی سالی ١٩٧٨ چاپخانەی مەعارف بغدا · لاپەڕە (١٣٦) ·

(١٥) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (١٢٦ـ١٣٠) ·

(١٦) کتێبێکمان بۆ بەدی هێنانی ئەم پرۆژەیە بەناونیشانی ( ڕەخنەسازی کوردی مێژوو و پراکتیکدا بۆ لە چاپدان ئامادەیە ) ·

(١٧) بڕوانە ڕۆژنامەی ژیان سالی (٧) ژمارە (٢٣٥) ڕۆژی پێنج شــــەمە ڕێکەوتی ٢٥ ئاغستوس ١٩٣٢ ناونیشان ئەدەبیاتی کوردی و شاعیرەکانمـــان نووسینی ( سیاپۆش ) هەروەها ژمارە ٢٣٦ ی ایلول ١٩٣٢ .

(١٨) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو .

(١٩) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو .

(٢٠) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو .

(٢١) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو .

(٢٢) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو .

(٢٣) بڕوانە دیوان بابە طاهیر هەمەدانی وحید دەستگردی ، بابا طاهر عریان ، چاپی دووەم ، تێران، (لاپەرە ٣٠) .

□□□□□□□□





▼▼▼▼▼▼

▼▼▼▼▼

▼

# چەمکی کوردو کرمانج لە مێژوودا

د. جمال رشید



کورد ناوی نەتەوەیی ئەو گەلەیە کە لەوڵاتێکی شاخاویدا دەژی . ئەم شوێنە دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵاتی تورکیاو ڕۆژ ئاوای ئێرانو باکوری عێراقو هێندێ شوێنی پچرپچر لە ژوورووی سوریەدا ئەم ناوچەیە بەکوردستان . وەیا بە وڵاتی کورد ناو دەبرێ . کە سنووری سیاسی یەو لە نەخشەی ڕەسمیشدا دیار نەکراوەو هەربەکەیان بەشێکی ئەم وڵاتانە پێک دێنێت . کە بەری کەوتوون .

ئەم ناوە بە واتا ( کورد ) لەلای ئەو گەلانەی . کە دراوسێی کوردن بەشێوەیەکی هێندێ جیاواز لەیەك کۆ کراوە کە هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتێتی زمانەوانی ئەو گەلانە وەکو : عەرەب دەڵێ ( کرد ) بۆ تاکو ( اکراد ) بۆ کۆ ، فارس دەڵێ کۆرد بۆ تاك وە کۆردهـا بۆ کۆ تورك دەڵێ کیورت بۆ تاکو کیورتلر بۆ کۆ بەڵام کورد خۆی لەپاڵی ئەم ناوەدا ناوی ( کورمانج یان کرمانج ) بۆ نەتەوە ، ( کە بە تایبەتی لە ناوچەکانی ژووروودا ) و ( کورمانجی یا کرمانجی )(١) بۆ زمانی نەتەوەییان بە کاردێنێت .

ئەم جۆرە دیاردەیە لەناو ناندا چەند سەدەیەکە لە لای گەلی کورددا هەیە تا ئەمڕۆش (٢) بەڵام

بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیری و پەرەسەندنی پێوەندی ئابووری هانیدان کە ناوی یەکەم ( کورد ) لە شوێنی خۆیدا بەکار بێت و بەرە بەرە لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواریدا بچەسپێت . هەروا ئەم ناوە لەدەرەوەی کوردستانیشدا بەکاردێت ، دەبێ چەمکی ( مفهوم ) ئەم دوو ناوە لەلای کورددا چی بێت ؟ ئەوەی زانراوە وشەی کورد لە زۆر لایەنێ جیاوازەوە ئەمەی خوارەوە دەگەیەنێت : —

ناوێکی گشتییە بۆ کۆمەڵێک مرۆڤ کە تایبەتێتی نەتەوەیی دیاری کراوی هەیە وە بەچەند قۆناخێکی مێژوویی ئاڵۆز و تێکەڵاودا تێپەڕیوە ، کە لە ئەنجامیدا هەندێ گۆڕان بەسەر جۆری و چۆنیەتی چەمکی ئەم ناوەدا هات .

وشەی کورد بە هۆی نیشانەی کۆی ( ـ آن )ەوە کۆدەکرێتەوە بۆیە هەندێ جار لە بریتی کورد کوردان ( کورد + آن ) بەکاردێ کە بەرامبەرەکەشی لەزمانانی عەرەبی و فارسی و تورکیدا لەمەوپێش باسکرا .

بەڵام کە ئەم ناوە وەکو ناوەڵناوێکی نسبی بەکاردێت بە یارمەتی پاشگری ( ـ ی ) دادەڕێژرێت وە دەبێتە کوردی وەکو

| بەزمانی کوردی | بە زمانی عەرەبی |
| --- | --- |
| گۆرانی‌ی کورد + ی | اغنیە كردیە |
| هەڵپەڕکێی کورد + ی | رقص كردي |

مامۆستا توفیق وهبی ئەم پایە بە ( وشەی پێوەند )(٣) ناو دەبا ، بەڵام ئەوەی لەم ڕستانەی سەرەوەدا ڕوون دەبێتەوە ئەوەیە کە ( ـ ی )ی یەکەم ئامرازی خستنە سەرە و ( ـ ی ) ی دووەمیش پاشگرە بۆ وشەی کورد کە لە شێوەی « کوردی »دا دەبێت (٤) ئەم پاسایەی زۆررو شێوەیەکی پەرەسەندوی هەندێک تایبەتێتی زمانە ئێرانییە کۆنەکانی بەری ڕۆژئاوایە کە دیاردەکانی لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا بەرچاو دەکەوێت وە بە تایبەتی لەو پاشگرانەی کە دۆخی ناوی لە سەرەتای ناویدا (٥) دادەڕێژن .

بەڵام وشەی کرمانج زاراوەیەکی تەواوە کە واتای نەتەوەی کورد دەگەیەنێت . بەخستنە سەری ( ـ ی ) بۆ سەرکۆتایی ئاوەڵناوی نسبی ( کرمانجی ) دادەڕێژرێ ، کە مەبەست لە بەکار هێنانی زمانی کوردییە . هەندێک لەو باوەڕەدان ( جی ) پەکە پاشگرێکی زمانی تورکییەو دەچێتە سەر ئەم وشەیە . بەڵام ئەم باوەڕە بۆ چوونە ڕاست نییە چونکە وشەی کرمانجی ناوڵناوێکی نسبییە وە بە یارمەتی پاشگری ( ی ) داڕێژراوەو دەچنە سەر کۆتایی ئەم وشانە پاسایەکی زمانەوانی کوردییە وە دوورە لە هەموو کاریگەرییەکی دەرەوە .

زاراوەی « کرمانجی » لەلای هەندێک کوردانی ژووروودا بە ناوی نەتەوەییش بەکاردێت کە خێڵەکی، ناوچەیی . ئاینزایی ( منهبی ) وەیا جیاوازی دیالێکت هۆی سەرهەڵدانێتی . لەلادێ دوورەکانی ئەم ناوچەیەدا تا وشەی کورد بەکار نایەت ئەم دیاردەیە لە خوارووشدا باوە لەبەر هەندێک هۆ لەوانە پەرتوبڵاوی جوگرافی وڵاتیان کە هەرکۆمەڵەی بەناوی جۆراوجۆر پەیدابوون کە لە ئەنجامی بیرێکی تەسکی کۆنی سەختگیری

ئاینیانەوە هەڵقوڵاوە ، هەروا نەزانینی چەمکی سیاسی و کۆمەڵایەتی نەتەوە لە سەدەکانی ڕابوردوودا یەکێکە لەم کاریگەرییانە ئەمانە هەموو بوونە هۆی دوورکەوتنەوە لە چەمکی فراوانی نەتەوە بۆیە تا هەندێ جار بە ( یەزیدی ـ زازا ـ گۆران ـ هەورامانی و لوڕی ) .. هتد ناوبراون بەڵام تایبەتێتی سایکۆلۆژی و دابو ژین و ژیاریان یەکیەتی نەتەوەیی ئەم گەلی کوردەی پاراستووە .

لەگەڵ ئەوانەشدا هەموو ئەم دوو ناوە ڕەگی مێژوویی و ئابووری‌یان هەیە کە کاری کردۆتە سەر هەستو پێوەندی کۆمەڵایەتی . چەمکی ئەم وشانە لەنێو زماندا واتایەکی تایبەتی و دیاری کراویان هەیە کە واتا کانیان بەپێی پەرەسەندنی پێوەندی دەگۆڕێ کە لە ئەنجامدا کەلەپووری کۆمەڵایەتی دەوڵەمەند تر دەکات .

ئەوەی ئاشکرایە کوردستان لەوەڕگەی بە پێی‌تێدا هەیە هۆزە کۆچەرەکانی هاوینان و زستانان لەدەشتەوە بۆ بەرزایی و بەپێچەوانەوە گەڕاونەو هاتو چۆیان کردووە هەر بۆیە لەدێر زەمانەوە ئەم بارەوای لە دانیشتوانی ئەم وڵاتە کردووە کە خۆیان بەپیشەی شوانکاری خەریک بکەن. ئەم جۆرە پێوەندییە بەرهەم هێنانە هەر لە کۆنەوە لەگەڵ ناوی کورد هاتووە هەر بۆیە لە سەرەتادا ئەم ناوە ئەوەندە بۆ ناونانی نەتەوە بەکار نەهاتووە هێندەی بۆ ناو نانی ئەو کۆمەڵە کۆچەرە کە بە شوانکاریەوە خەریک بوون بەکار هاتووە (٦) .

هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە لە نێو کتێبە کۆنەکاندا ( کارنامەک ) ئەردەشێری یەکان - دامەزرێنەری دەولەتی ساسانی بەکورد دادەنێن بەلگەشیان بۆ ئەمە ئەو خێزانەیە کە تێیدا پەروەردە بووە کە لە ناوچەی ( اصطخر )دا بووە ، وە دەکەوێتە خوارووی ڕۆژ ئاوای ئێرانو پیشەیان شوانکاری بووە ·

مێژوو نووسی ئیسلامی ( طبری ) ئەو نامەیەمان دێنێتەوە یاد . کە لەنێو کتێبە کۆنەکانی ئێرانی‌دا باسکراوە ، کەوا ئەردەوانی پێنجەم ، دوا پاشای فرثی‌یەکان ئەم تێکستەی خوارەوی بۆ ئەردەشێر نووسیوە دەڵێ : « انك قد عدوت طورك واجتلبت حتفك ایها الكردي المربى فى خيم الاكراد من اذن لك بالتاج الذى لبسته ··· الخ »(٧) ·

واتاکەی بەکوردی ( تۆ پێت لە ئەندازەی بەرەی خۆت تێ‌پەڕاندووە وادیارە ناکامت هاتووە . ئەی ئەو کوردەی کە لە نێو خێوەتی کورداندا پەروەردەکراوی بەدەستوری کێ تاجت لەسەر ناوە ··· ) ·

وەبێ مەبەستی ئەردەوان لەم نامەیەدا لە ئەسڵی ئەردەشێردا میللەتی کورد بووبێ · بەلکو بۆ ئەو چینە شوانکارە بووە · کە مافی داواکردنی پاشایەتی‌و تاج لەسەر نانێ نەبووە ئەم جۆرە کوردانە لەبەشی نێوە ڕاستو باشووری ئێراندا پەرتو بڵاو بون . هەتا ئەمڕۆش ئەم ناوە بەواتای چینایەتی تەسکی لەلایەن هۆزەکانی جافدا بەکار دێت جگە لەوەی ، لوڕ بەو کوردانەی کە لە هۆزی خۆیان نەبن بەجانیان نێو دەبەن . هەروا وشەی گۆرانیش بۆ ئەو دانیشتووە نیشتەجێ بووانە هاتووە کە بەکشتوکاڵەوە خەریکن(٨) ئەو ڕاستی‌یانەی لە ژووروودا باسکران ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کە ئەم ناوە لەسەرەتادا بۆ ئەو کۆمەلە بەکار هاتووە کە نیشتەجێ نەبووە · بەلام لەدوابیدا بەربەرە بووە بەنێوی گەلێك کە ماوەی چەند سەدەیە کە هەموو تایبەتێتی نەتەوەیی هەیە ·

وە دەربارەی وشەی کرمانج هیچ شوێنەوارو بەلگەیەکی مێژوویی بەر لەسەدەی شازدەمان بۆ بەجێ نەماوە بەلام ( د · جەمال نەبەز ) لەدوای لێکۆلینەوەی زانستانەی تایبەتی خۆی کە لەڕووی زانستی زمانەوانیەوە کردوویە بۆ ئەوە چوە کەوا وشەی کرمانج لە وشەی کورد کۆنترە وە لە دوو وشەی لێکدراو کورد + ماد//کوردماد پێکهاتووە(٩) · کە بەبێ بەلگەی مێژوویی ناتوانریت ئەم ڕایە بسەلمێنریت ·

ئەوەی شایانی باسە ( ق · مینۆرسکی ) پەنجەی بۆ ئەم کێشەیە درێژ کردووە گوتویەتی :- « ناوی کورد لە زمانی ئەرمەنیدا کە دراوسێ‌یەکی کۆنی کورد بووە - مار - بووە » ئەم وشەیە بەپێی دەستوری زمانەوانی زمانی ئەرمەنی بەرامبەر بە نێوی کۆنی میدی‌یان بووە (Mada) هەروەها ( مینۆرسکی ) گوتوویەتی

« بەشی ڕۆژ ئاوای ناوچەی ماکۆ لەئێراندا وە بەتایبەتی ناوچەی - دامبات - کە - موسی الخورینی - نێوی دەبات تا ئەمڕۆش کوردی تیدا نیشتەجێ‌یە » ·

« گەر لەزمانی ئەرمەنیدا (Mada) وەکو مار هاتبێ ئەوە لەزمانی فارسیدا لە شێوەی ((Mah)) هاتووە کەواتە شێوە کۆنەکانی ئەم ناوەی ( ماکو ) ( ماهکولا Mah—Kuh ) بووە بەوردی پێوەندی کورد بە میدی‌یەکان دەسەلمێنێ » ·

لەدوای ئەمەدا ( مینۆرسکی ) پرسیارێك دەرباری گۆڕینی ناوی کورد دەکا کە بە کوردیان کرمانج بەکاردێو دەڵێ : « وەلامی ئەم پرسیارە لەوەدایە کە دەولەتی - (Mada)- بریتی بووە لە چەندین هۆزی جیاوازی جیاواز کوردەکان توانیویانەو بۆیان لواوە نێو خۆیان بە نێوی یەکێ لەم هۆزە ناودارانە بکەن ، کە لەڕووی هێزو سوپاوە تایبەتێتی دیاری کراویان هەبووە » مینۆرسکی لەو باوەڕەشدایە کە « دوورنی‌یە نێوی کوردبۆ نێوی گەلێکی تر بگەڕێتەوە لە کوردەکان خاکیان داگیر کردوون »(١٠) ·

گریمان ئیتمۆلۆجی وشەی کرمانج لە وشەی لێکدراوی ( کورد ماد ) ەوە هاتبێ وەکو ( د. نەبەز ) بۆی چووە ئەم بیروڕایە لە گەل وشەی ( کورد ) دا لە پەیدابونی لەمێژوودا ڕێك ناکەوێ کە لەسەر دەمی ساسانی‌و سەرەتای پەیدا بوونی ئیسلامدا بەشێوەیەکی جوێ لە وشەی « ماد » دا باو بووە · لە هەمان کاتدا نابێ ئەوەش لەیاد بکرێ کەوا لەم سەردەمەدا لە خوارووی کوردوستاندا ناوی مادیکان(١١) ·

بۆ کۆمەلە هێزێکی دیاری کراوی شا مادك کە پاشای کوردان بووە بەکار هاتووە جا گەر سەرچاوەی بنچینەی وشەی کرمانج وشەی لێکدراوی « کورد + ماد » وە پیکهاتبێت ، لەم لێکدانە زمانەوانی‌یەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا وشەی ( کورد ) لە وشەی

( کرمانج ) کۆنترە نەك کرمانج وەکو ( د . نەبەز ) بۆی چوبە . مینۆرسکی و نەبەز لەبیروڕای لێکدانی دوو ناوی ( مارو کورد ) دا دەگەنە یەك کاتێ کە مینۆرسکی وەڵامی ئەو پرسیارەی خۆی دەداتەوە لەبارەی گۆڕانی ناوی نوردو دەڵێ : « ناوی کورد بەستراوە بە یەکێ لەو هۆزە بەناوبانگانەی کە تایبەتێتی سوپایی هەبووە وەیا لەگەڵ هۆزی ( ماد ) دا پێوەندو پێوەست بووە وەیەکیەتی لەگەڵیان پەیدا کردووە » .

ئەوەی ڕاستە وەنەبێ ـ مار ـ ناوی نەتەوەی کورد بووبێ بەڵکو لەزمانی ئەرمەنیدا بەمیدی گوتراوە ـ مار ـ مینۆرسکی لەهەمان وتاریدا ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە :ـ

« ئەرمەنی‌یەکان بە مادیان گوتووە ـ مار ـ وە فارسەکان ( ماە ) یان پێ‌گوتووە . بەڵام وشەی کورد بۆ دانیشتوانی نەنیشتەجێ بەکار هاتووە » .

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستی‌یانەی ژووررو هیچ سەیر نی‌یە گەر هەندێ هۆزی کۆچەری دەیلەم (زازا) ناوی کوردیان لێ بنرێ وە دەورێکی بالایان لەبنیات نانی نەتەوەی کورددا هەبووبێ لەکاتی هاتنیاندا بۆ کوردستان وە بەتایبەتی بۆ ناوچەی ( ملاطیە و دەرسیم )(١٢) .

کاتێ لەکتیبەکانی زمانی سریانی دەکۆلینەوە تەنها وشەی « کوردانایە = کوردان + آیە » ودیا « کوردایە = کورد + آیە » مان بەرچاو دەکەوێت. ( ـ آیە ) نیشانەی ناسیاری‌یە لە زمانی سریانیدا ئەم ناوە بۆ نەتەوەی کورد لەنێوان سەدەی هەشتەم و سیانزەمدا بەکارهاتووە(١٣) لەدوای ئەودا یەکسەر وشەی « کارد » لەلایەن گەڕۆکی ئیتالی‌یەوە ( مارکۆ پۆلۆ) لەسەدەی سیانزەمدا لە گەشتەکەیدا لە ئەرمینیا، کە بە کوردستاندا تێپەڕیوەو گەیشتۆتە موسل بەرچاو دەکەوێت(١٤) .

لەگەڵ ئەمانەشدا مێژوو نوسانی رۆمێنی و یۆنانی لە بیۆ بەرهەمەکانیاندا ناوی وڵاتی ( کوردوینی Corduene ) هێناوە . ئەم وڵاتە هەندێ لەو ناوچانە دەگرێتەوە کە بەدیالێکتی کرمانجی ژووررو دەدوێن وە لەمانە شاری ئامیدی ( دیار بەکر )(١٥) کەواتە وشەی کرمانج لە هیچ سەرچاوەیەکی سریانی ـ عەرەبی ـ ئەرمەنی و زمانانی دیدا نەهاتووە .

بەپێی ئەم باسانەی سەرەوەدا دەتوانین بڵێین وشەی کورد لەڕووی کاتەوە لە کرمانج کۆنترە وە لە سەرەتادا بەکۆچەرانیان وتووە وە کرمانج وشەیەکی کوردی‌یەو گەلی کورد خۆی بۆ ناونانی نەتەوەکەی لەزمانی کوردیدا بەکاری دەهێنێ .

لەسەردەمی ئەمڕۆدا لەزمانی کوردیدا وشەی کرمانج واتایەکی چینایەتی دەبەخشێ ، کە لەڕاستیدا ( جوتیارو ڕەنجدەر ) دەگرێتەوە ئەم واتایە لە ناوچەی هەولێردا باوە کە شێوەی زمانەگەی بەر

دیالێکتی کرمانجی خوارود دەکەوێ هەمان واتا لە دیالێکتی ژووررووشدا هەیە بۆ وێنە داوای کارێ لەیەکێ دەکەی شیاوی ئەوە نەبێت لە وەڵامدا دەڵێ : « چما ئەز کرمانجێ بابێ تەمە ؟ » کەواتە کرمانج چینێکی چەوساوە لە کۆمەلگەیەکی دەرەبەگیدا بەکار هاتووە لەگەڵ سەر هەڵدانی دەرەبەگایەتیدا لە کوردستاندا ئەم وشەیەش پێکهاتووە لە ئەنجامی پەرەسەندنی پێوەندی بەرهەم هێنانەوە بووە . لەگۆڕانی ژیان لەشوانکارەییەوە بۆ نیشتەجێیی .

کەواتە دەتوانین بڵێین وشەی « کورد » لە وشەی « کرمانج » کۆنترە لەڕووی دوو چەمکی جۆراو جۆری پێوەندی ئابووری‌یەوە . وە شوێنی شیاوی خۆی لە زمانی کوردیدا بۆ ناو نانی گەلی کورد چەسپیوە . چونکە هۆیەکانی بەرهەم هێنانی ژینی شوانکارەیی پێش هۆیەکانی بەرهەم هێنانی ژینی کشتوکاڵی کەوتووە . کەواتە ئەم دوو بابەتە بەبناخەی سەرەکی ناو نانو بەکارهێنانی (کورد)و کرمانج دادەندرێ(١٦) .

وشەی کرمانج وەکو ناوێکی چینایەتی بۆ دەووروبەری سەدەی دەیەمی زایینی دەگەڕێتەوە ئەمەش نابێتە هۆی پەیدا نەبوونی بەشێوەیەکی لێکدراو . بەڵام بۆ پەیدا کردنی پێوەندی فیلۆلۆژی نێوان هەردوو ناوو ناوانی جوگرافیدا وەك گرمانشاو کرمان(١٧) ئامان گەیەنێتە سەر بنچینەیەکی هاوبەش چونکە لەنێوان ئەم وشانەدا لە هەموو بارێکدا تەنیا «ك ؛ ز» بەڵام پیتی « و . ر » یان « م . ا . ن . » یە بەپیتی هاوبەشی نێوان دوو ناوەکە ناژمێردرێن . گەر کرمانج وشەیەکی لێکدراو بێت کورد لێکدراو نی‌یەو ئێمە هیچ بەلگەیەکی مێژوییمان نی‌یە بۆ ئەوەی بنچینەی هاوبەشیان بگەیەنێت لەنێو ئەو ناوانەدا جا بۆیە هیچ پێویست ناکات بەدوای ئەسڵ و بناخەیاندا

بکەرێین چونکە هەردوو وشە کوردوو کرمانج بەپێی واتای تایبەتی خۆیان هەتائەمرۆ لەکوردستاندا بەکار دێن .

## تێ بینی یەکان وسەرچاوەکان

(١) مامۆستا توفیق وەهبی لەبەر رۆشنایی کتێبی شەرەفنامەدا ئەڵێت : « ئەو کوردانەی کە لەسەر ئەو هێڵەی لە کرمانشاوە ـ خانەقین قشقەو لە کەنارەکانی دجلە بەرەو باکوورو باکوری رۆژئاوا ئەژین بە کرمانج دائەنرێن بێجگە لەگۆران » .

وە ئەمرۆ ئەو کوردانەی لە باکوری هێڵی میاندواب ـ شنۆ ـ زابی گەورە ـ و هەتا ( میمنی ) ئەژین ناوی خۆیان ناوە کرمانج . ( بێجگە لە زازا ) .

بگەڕێرەوە بۆ گوڤاری پرشنگ pirsing ژمارە (٤) . نوفمبر ١٩٧٢ ، ٢٢٢٧ لەڕاستیا ئەگەر زمانی کوردی بە شێوەی گشتی دابەش بکەین بە دوو دیالیکتی سەرەکی یەوە . زووروو ( کرمانج ) کە کوردەکانی تورکیا ( بێجگە لەزازا ) وە بەشێک لە کوردەکانی ئێران ( دەوری شاری خۆی ـ وماکو رۆژئاوای اورمیا) و رۆژئاوای رێگەی حاجی هۆمەران ـ خەلیفان لە عیراقو هەموو کوردەکانی سوریا قسەی پێدەکەن ، وە هەرچی بەشەکانی ترە لە کوردستان کە ماوە بە دیالیکتی خوارو ( کوردی ) ئەدوێن لەبەر ئەمە ئەتوانین بڵێین ئەوانەی بەکرمانجی قسە دەکەن خۆیان بە ( کرمانج ) ناو ئەبەن . بەڵام هەرچی ئەوانەی خواروون ( کورد ) ن .

بۆ زیاد کردنی زانیاری دەربارەی کورد ، سەیری وتارەکەی ف . مینورسکی بکە لە ( دائرة المعارف الاسلامیة ) دا بەشی دووەم ، ( مادة الکرد ) .

(٢) بۆ ئەم دوو ناو نانە سەیری نوسراوە کوردی یەکان بکە کە لەسەدەی شانزەو حەفدەدا دانراوە وەکو شەرەفنامەو مەم و زین و هی تر ، کە خاوەنەکانیان ئەو دوو وشەیەیان داناوە وەکو سینۆ نیمێک بەرامبەر یەك واتا .

(٣) سەیری ( رێزمانی کوردی ) ی مامۆستا توفیق وەهبی بکە ، بەشی یەکەم بەغدا ، ١٩٥٦ ، لا ١٥ ـ کە تیایا مامۆستا توفیق وەهبی مێژووی ئەم ( یاء ) ی پێوەستەی شی کردۆتەوە کە ( هیە hya ) یە لە فارسی کۆندا . کە لە بنچینەدا ئاوێتەیە لە جێناوی نیشانەی ئاڤێستی « هە ha» = ئەوو . و جێناوی پێوەستی ( یە ya ) ی هیندی ـ ئێرانی یە . بۆمێ ( یە ya ) ی ئاڤێستی ( یا ) ، کردنی جێناوی پێوەستی ( هیە hya ) بەمێ لە ( هیا hya ) وە هاتووە .

سەیری ( بنچینەی ناونانی شارەزوور ) ی توفیق وەهبی بکە .

گۆڤاری سۆمر ، بەرگی شانزە ـ بەغدا ـ ١٩٦٠، ١٤١٧ .

(٤) تسوکرمان شوێنی ( یا ) ی ئیزافەی لە زمانی کوردیدا شی کردۆتەوە وەلێکۆلینەوە کەی بەراورد کردوە لەگەڵ لێکۆلینەوەکانی « پیترلیرخ » . کە پروفیسور بوو لە زانکۆی ( بطرس برگە ) وە ناوی ناوە دۆخی رەسەن ( جنس ) Roditeln ogo padej وەچواندویەتی بە ( ئی ) فارسی بەڵام یەکەمجار لە (a ، e) وە بۆ (ز) ئینجا کاتێ بەکارئەهێنرێ کە دوای ئاوەڵناو یان جێناوی ناوی وەسف کراو دووەم جار . وە ( ز ) ئەگۆڕێ دوای ئەوە بۆ ( e ) وەکو :

ریشی من سپی یە

Vie minesepte I . I . Tsnker man Ocherki Grammatika Kuvdsogoyazika. Tom. vi . بکە M. 1956, str. 56

سەیری

(٥) ( دارای یەکەمی ئەخمینی ) بۆ نموونە لە وەسفی دروست کردنی کۆشکەکەیدا ئەڵێت : کە ساکا هیا کاباو تاکا اوتا سینکا بروشی هیا ایدە کرتا هاوف هاچا سوگودا » دێری ژمارە (٣٧) ودوای ئەو . . .

**وەرگێڕانەکەی :**

« ئەو بەردە بلوری یە شین و خۆڵەمێشی یە سورباوەی کە لێرەدا دروست کراون لە صەدەفەوە ئامادەکرابوون » سەیری وتارەکەی بایلی بکە .

H. W. BAILEY; The persian lauguage. The legacy of persia ox Lord, 1953. p. 177

ئەو زیادانەی وەک دەرئەکەوێ لە ئاوەڵناو ناوەکاندا : کە ساکاو کاباو تاکا ... هتد بەیەکەوە بەستراون یان هەریەکێکیان خراوەتە سەر ئەوی تریان بەهۆی ئامرازی ( هیا ) وە کە رێی تێ نەچێ لە کرمانجیشدا گوێ مان لێ بێتو لەهەمان شوێنیشدا . بەڵام لە دۆخی رەسەنی مێ دا ...

وا باشە کەوا تێ بینی یەکی تریشی بخەمە سەر ئەویش کە (١) ئەکەوێتە دوای پیتی بێ دەنگەوە : بەڵام کە ( یاء ) پێشی ئەکەوێ و ئەبێ بە ( یا ) لە باری ئەواو بوونی وشە بەپیتی دەنگدار ، وەکو :

شیرین چوو سەرکانی گولانێ شیرین چوو بۆ کانی گوڵان .

بروفیسۆر ق · کوردوییف ناوی موصوف ئەنێ لەم ناوانەو نموونەیان لەسەر ئەدات وەکو ·

لــــە

دۆخی

نێردا

خانیێ بلند · خانووی بەرز

بازارێ رند · بازاری جوان ·

لــــە

دۆخی

مێدا

ئالای سور · ئالآی سوور ·

زیا هاســـن · رێگـای ئاسن

سەیری ک ·

ک کوردویێف بکە ·

K. K. Kurdoev, Grammatika Kurdskogo yzika ( Kurmancni ) Fonetika Morfolo - giya, M - L 1957 str 32-33

ئەتوانرێ ناوەکانو ناوەلناوەکان بەکاربهێنرێن بەبێ ناو بردنی ( یا ) وەکو :

کورد زمان ، رەش بەلەک ، بەدکار ، پیرە قەل ، گوللە بەند ، پیرە مێرد و ··· هتـــــد ، لە دیالیکتی خوارووی زمانی کوردیدا ·

وەلێرەدا پێویستە ئاوەلناوەکان پێش ناوەکان بکەون ، بەبیروڕای · مامۆستا توفیق وەهبی وشـەی پێوەستی ( ـ ی ) لـە بنـــەڕەتا جێناوی پێوەستی ئاڤێستی « یە ya » بۆ نێر وە « یا » بۆمێ ئەمەش لەم شێوانەی خوارەوەدا بەکار ئەهێنرێ :ـ

لە دیالیکتە کرمانجی‌یەکاندا أ جێناوی پێوەستی نێری ئاڤێستی « یا ya » لەشێوەیێ « ی » دا لەکاری وشەی پێوەست لەنێوان ناوی نێرو تەواو کەرەکانی (ناو ، سیفەت ) وەکو : دایکا خورشید ، ناوی مــێ بەمێ دایکا پیر ـ ناوی مێی تەواوکراو بە ئاوەلناو ·

سەیری ( بنچینەی ناونانێ شارەزوور )ی توفیق وەهبی لا ١٤٢ بکە .

(٦)دەربارەی کوردوەکـو شوانکارە · ســـەیری ( تیودور نولدکە ) بکە ·

Th. Noldeke. **Gschichte** de Artach siri **papakan GoHingen 1879**. p 48, 49, 50

( ابن حوقل ) ناوی ( کوردان **ی ناوە**

لەو شوێنەی کە مەسیحی‌یەکـــــان تیا نیشتەجێن لەجزیرەدا ، بەلآم ( ابن حوقل ) ناوی قەبارەی (خێل)ی کوردەکانی باس کردووە وەک بەشێک لە دانیشتوانی ناوچەی فارس . وەهەروەها ابن حوقل ئــــەلێ = ژمارەیان نە ئەزانرا ، وەئەلێن کە لەپێنج سەد هەزار رەشماڵ زیاتریان هەبووە ، وە ( لە ) هاویندا بەرەو لەوەڕگەکان رۆیشتونو دوایی گەڕاونەتەوە شـــوێنی خۆیان لە زستاندا ··· هتد ·

کتێبی ( مسالك وممـــــالك )ی ابن حـــوقل . بــــەفارسی ، لێدوان ·

SIR WILLIAM OUSELELY,1800, p 56،83.

هەروەها ســــەیری ( المسالك والممالك ) بکە . لێدوانی د · محمد جابر عبدالعال الحینی قاهـــرة ـ ١٩٦١ . لا ٦٨ .

شتێکێ سەیر نی‌یــە کــە ( ابن الاثیر ) چیرۆکی پێغەمبەر ( ئیبراهیم )و ڕووداوەکانی ســـــەردەمی ( نەمرود )و پەیوەندی‌یان بە کوردەوە وەکو خێـــلی کۆچەر ئاتێ کە ئەلێ :··· ئینجا نەمرودو هاورێکانی کۆبوونەوە دزی ئیبراهیم · وتیان بیسوتێنن خواکەتان رزگار بکەن ، عبداللە کـوڕی عمر وتی یـــەکێ لـە کۆچەرەکانی فارسی پەنجەی بۆ ئەوە راکێشا کــــە ئیبراهیم بسوتێنن وتیان ، فارسەکان کۆچەریـــان هەیە؟ وتی : بەلێ کوردەکان کۆچەری فارسن ـ ئەلێن ئەم کۆچەرە فارسە ناوی ( هیزن ) بووە کە ئیتر زەوی نەیگرتۆتە خۆیو سرەوتی نەبووە هەتا رۆژی دوایی · ··· هتد ) سەیری ( ابن الاثیر ) . الکامل فی التاریخ بەشی‌یەکەم چاپی لـیدن ١٨٦٦ . لا ٧٠ ـ بکە .

هەندێ جار وشەی ( کورد ) لەهەندێ زمانـدا کۆمەلی خێلەکی ئەگرێتەوە کە ناویان دەرکردووە بـە ئل ڕەقیو روت کردنەوە ، وەکو لای جیورجیە ـ کانو هەروەها کە سارماتینەکان لە پۆلندا بەو رەوشتە بـە ناوبانگ بوون ئەمەش ناوەرۆکی وشــــــەکە روون ئەکاتەوە . وە هەروەها دەری ئەخات ئەم ناوە چـــۆن راوە لەو دانە خێلەکی یانە کە نیمچە کۆچەرن ·

(٧)ـ طبري ، تأريخ الرسل والملوك ، بەشی دووەم، چاپی دووەم ، ( دار المعارف ) لە میسر ـ لا ٣٩ .

(٨)ـ مامۆستا موکـــەررەم تالەبانی ئەلێت کــــە ( رژێمی دەرەبەگی سەربازی ئەبێ بەهۆی پەیدا بوونی چەند کۆمەلێ لە شەڕکـەرەکان کە ئیشیان هــــەر شەڕکردن بوو بەبێ ئەوەی پەیوەندی‌یان هەبێت بـە

نیشو کاری بەرهەمی کشتوکاڵەوە ، وە ئەم کۆمەڵـە بەراستی لە کوردستانا هەبوونو بەتەواوی جیاواز بوون لە ( گۆران ) ـ کە ناوێکە نراوە لە چینی کرێکاران لە کوردستانا ( گۆران ) چینێك بوون کە مەڵنەستان بەنیشو کاری کشتوکاڵی .

( کوردو گۆران ) ئەم دوو ناونانە وەك دوو وشە بەرامبەر یەك ( سیونیم ) نین وە ئەم دوو وشەیە لە مێژووەوە دروست بووە بە هۆی جیاوازی چینایەتی یەوە .

سەیری ( المدلول الطبقی لعبارة ـ کوردو گۆران ـ في النظام الاقطاعي )ی مکرم الطالبانی بکە . کە گۆڤارێکی روشنبیری نوێیە ، ژمارە ( ٢٥ ) بەغدا . ١٩٧١ ـ ل ٢٧ ـ ٢٨ .

(٩)ـ بگەرێرەوە بۆ و تارەکەی ( د. جمال نەبەز ) لە گۆڤاری ئاسۆیی زانکۆیی ژمارە (٩) ـ سلیمانی ( ١٩٧٨ ) . ل ٩١ دا .

(١٠) ـ فلادیمێر مینورسکی ، کوردەکان نەوەی میدییەکانن . گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد . بەرگی یەکەم . ژمارەی یەکەم . بەغدا ١٩٧٣ .

(١٢)ـ کارل هادانك Karl Hadank کەیشتۆتە باوەڕێک بەپێی قسەکانی ئوسکارمان کە ناونانی ناوخۆیی دیملی لەلای زازاکان بەکار ئەهێنرێ وەکو مانایەکی ئەتنیکی ( نەتەوایەتی )و زمانەوانی ... وەلەو باوەڕدایە کە ئەم ناونانە لە بنچینەوە لەگەڵ ئەو گۆڕانەی کە لەنێوان دوو پیتی ( ل . م )دا رووی داوە . هەروەکو یوسف مارکوارت Jos. Markwrat لە بارەی ئەم تیوری یەوە دەڵێ کە زازاکان لە ترویاتینا ( ئاذربیجان ) ەوە هاتوون .

سەیری Karl Hadank., Mundarten Berlin 1932 ل ٤١١ بکە .

مینورسکی ئەڵێ : زازاکان کە لە باکوری دیار بەکر هەتا پالوو دەرسیم ئەژین . تائێستا بەزمانی ئێرانی قسە دەکەنو ناوی Dimla یان لە خۆیان ناوە کە (F. C. And reas) • لەگەڵ ناوی دیلەمدا بەرامبەری ئەکات .

بگەرێرەوە بۆ :

V. Minorsky: History of sharvan 1958. P. 23. 5

( ابو دلف ) ئەڵێت : لێدوانی منیورسکی ، چاپی قاهرة ١٩٥٥ ـ ل ٢٥ .

• کە ناوچەیەك هەبوو ناوی دیلمستان بووە لەنزیکەی ٧ فرسخ لە رۆژهەڵاتی شارەزوورەوە وەڵبەندی دەیلەمەکان بوە لەکاتی پاشایانی کونی فارس • وەلەوێدا گوندی جیاجیا هەیە لە کوردستاندا بەناوی ( دیلمان )ەوە . وەکو ئەوەی لەنزیك لاهیجانو نزیکی گەڵەو باکوری دەریاچەی اورمیالای سلماس .

هەروەها سەیری ( یاقوت الحموی . کتاب معجم البلدان ) چاپی ١٩٠٦ بەشی چوارەم ـ ل ١٨٦ ، وە بەشی ( پێنجەم ل ٢١٣ ـ بکە .

ل ٥٦٠، ٥٦٣ ، و تێبینی ژمارە (٢٢) وەرگێڕانو لێدوانی کمال مظهر احمد .

(١١)ـ ( نولدکە ) لەو باوەڕەدایە کە ( مادك ) یا ( مادك ئەصل ) ( ماهی ) یە لەفارسی نویدا وەلە بنچینەدا ئەگەڕێتەوە بۆ میدییەکان کە ناویان ئەوکاتەوە بوو بە ( مادیکان ) .

بگەڕێرەوە بۆ :

Th. Noldeke; *Geschichte des* Artachšir i Papakan. Gottingen - 1879 - P. 4

١٣ ـ بۆ نموونە سەیری ( مێژووی تۆماس ـ اسقف مرغە ) بکە لە سەدەی نۆهەمدا ـ لەکاتێکا لەسەر ناوچەی کوردەکان ئەدوێ .

The Historia Monastica of Thamas Bishop oh Manga A. B. 840. Edited by Eruest

A. Wallis Badge LITT. O. London. 1893. P. 69

هەروەها سەیری نوسراوەکانی ابن العبری ، بکە .

The chronography Gregory Abul Faraj Bar, Hebraens. Being the First Part of his political history of the World. Ed. By Ernest A. Wallis Budge. vol. I Oxford University Press 1932. P. 131, 139

وەهی تریش

پاشماوەی لە ل ٧٢

# نەورۆزو ئاگرو بەهار

محمد امین هەورامانی



یادکردنەوەی جەژنی نەورۆز لەلایەن گەلە ئێرانییەکانەوە . بە شێوەی ئاهەنگگێرانو ئاگر کردنەوە . وەك لە چەند سەرچاوەیەکی دێریندا بەرچاومان دەکەوێ . بۆ دێرین وەختو دێرین زەمان دەگەڕێتەوە . بێگومان ئەم یادکردنەوەیە بەو جۆرە دوو ڕەوالەتیە . دەبێ لەبەر هەندێ ڕووی دینیو سیاسی ناو بە ناو خۆی شاردبێتەوە .

هەرچەندە ئەم جەژنە جەژنی گەلە ئێرانییەکان بووە . بەڵام بۆ ماوەیەکی دوورو درێژیش هەندێ گەلانی . عارەب . بە تایبەتی ئەوانەیان دراوسێی گەلە ئێرانییەکان بوون ، یاخود لەنێو چوارچێوەی یاسایاندا ژیاون . هەر لاسایی ئەوانیان کردووەتەوە . تاوەکو هاتنی ئیسلامو بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلامیو دەستەڵاتداری حکومەتی ئیسلامو دەست ڕۆیشتوویی بەسەر هەموو گەلانی عارەبو گەلە ئێرانییەکاندا بەرە بەرە . ئەم نەریتو یادکردنەوەیە خۆی شاردەوە جگە لە نێو گەلە ئێرانییەکاندا کە بە وێنەی خۆییو بکرە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو گۆڕانو زیاتر گوێپێدانو زیاتر ڕێزگرتنو زیاتر بە پیرۆزی تەماشاکردن ، ڕۆیشت .

لە کوردستانی عیراقدا . جەژنی نەورۆز بەرەو نەمان چووە . تا وای لێهاتووە . بە جەژنی گەلی فارس ـ یان زانیوەو بۆیە هیچ جۆرە یادێکیان نەکردووەتەوە . ئەمەش تا سەرەتای چەرخی بیستەم بەردەوام بوو . .

نیشتەجێبوونی ـ پیرەمێرد لە سلێمانی(١) ، وەك مامۆستایەکی گەلی، وەك ڕۆژنامەگەرێو

دەرکردنی ڕۆژنامەی ( ژیان ) ئەوجا ــ ژین ـ بوو بە هۆی زیندووکردنەوەی ئەو جەژنە نەتەوەیی یە لەنێو کوردەکانی کوردستانی عیراقدا ..

دەسپێشخەری کردنی پیرەمێرد بۆ گێڕانی ئاهەنگی نەورۆز بەبۆنەی یادکردنەوەی جەژنی نەورۆزەوە . چ بە ئاگر کردنەوە . چ بە وتار خوێندنەوەو ڕۆشن کردنەوەی مێژووی سەرگوزەشتەکانی ئەو ڕووداوانە کە بوونەتە هۆی بەرپابوونی نەورۆز . بە ڕاستی خۆی لە خۆیدا قوتابخانەیەکی میللی بوو . بۆ بووژاندنەوەی گیانی کوردایەتی . بووژاندنەوەی مێژووی دێرینی کوردو سەرگوزەشتە شێرانەکانیان، جگە لەوەی کە قوتابخانەیەك بوو بۆ هاندانی شاعیرو نووسەرانی کورد کە لاسایی پیرەمێرد بکەنەوە . چ لە ئاهەنگ گێڕانو یادکردنەوەدا . چ لە هۆنینەوەی ئاوازی ڕێکو پێکداو چ لەڕووی نووسینی مێژووی سەرگوزەشتەکانی دێرینی ڕووداوەکانی نەورۆزدا .

بەرە بەرە کردنی ژیانو ژینو گەلاوێژو پێشکەوتنو شەفەقو هەتاوو ڕۆژی کوردستان . بەیانو . ڕۆشنبیری نوێو نووسەری کوردو ڕۆژی کوردستانو هاوکاریو پاشکۆی عیراقی کوردیو بیری نوێو پەروەردەو زانستو تەنانەت هەندێ وتاری عارەبی، کە لە ڕۆژنامە عارەبی یەکاندا نووسراون . ئەو وتەیەی سەرەوەمان بەهێز دەکا .

هەموو ساڵێك شاعیری کورد زۆر نەبێ کەم . بەچەند وشەیەکی ڕێکخراوی ئاوازەدار . هەستی دەروونی خۆی وەك تێگەیشتنی خۆی یادی نەورۆزی کردووەتەوە . نووسەری دیکەی کوردیش ، زۆر نەبێ کەم بە وشەیەك یان بە چەند وشەیەك هەستی دڵو دەروونی خۆی وەك تێگەیشتنی خۆی یادی نەرۆزی دەربڕیوە .

ئەوەی کە شایەنی باسە ، زۆربەیان . دانیان بەوەدا ناوە کە جەژنی نەورۆز جەژنێکی مێژوویی یە، وەك جەژنی ژیانەوەی دارو درەخت بێ ، ئاوەها پیایانا هەڵداوە . لەگەڵ ئەوەشا تاکو تەراکێ لەوانە . بنو بناوانی ڕووداوە مێژوویی یەکانی نەورۆزیان داپشکاندووەو بە پێی قەناعەتی تێگەیشتنی خۆیان لەو بارەیەوە . بە وشە . لە نێو لاپەڕەی گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی یەکاندا دەدرەوشێتەوە .

هەریەکێ لەمانە . بەلای کەمی یەوە . لە لایەکەوە هەر پێکاویەتی ئەگەرچی لێرەدا نکوولی یەکی گەورە هەیە . کە ئەویش نێو نەهێنانی ئەو سەرچاوەیە یە .کە سوودی لێوە وەرگرتووە ..

بەم بۆنەیەوە . بە پێویستی دەزانم بە وێنە جەوهەری هەندێ لەو نووسینانە ، پەخشان . یاخود شیعر . بهێنمەوە یاد بۆ مەبەستی تێڕوانینیان . بۆ زانینی ڕادەی دەرکەوتنی سەرگوزەشتەی ڕووداوەکانی نەورۆز و بۆ دیاری کردنی ئەو لایەی کە بە گرنگی گرتووە .

١ـ پەخشان

مامۆستا عەلائەددین سەجادی لە ڕۆژنامەی ژین ( ژمارە ــ ١٣٣٧ ) دا(٢) بە ناونیشانی ( مێژووی نەورۆز)ەوە وتارێکی بڵاوکردووەتەوە، کە جەوهەرەکەی ئەمەیە : جەمشید پاش ئەوەی تەختێکی باشیان بۆ دروست کرد . لە سەری دانیشتو تاجی شاهیی کردە سەری ، ڕۆژ هەڵهاتو شوڵەی لە تاجەکەی دا ، ئەو ڕۆژە کە ڕێککەوتی (٢١) ی مارتی دەکرد پێی دەوترێ نەورۆز .

مامۆستا سەجادی . لە ژمارە (١٣٨٦) ی ژیندا(٣)، وتارێکی دیکەی بە بیرێکی ترەوە کە دژە لەگەڵ ئەوەی پێشوودا ، بە بۆنەی نەورۆزەوە بڵاوکردوتەوە. ئەوەی جێگای ڕەخنە بێ . ئەوەیە . کە مامۆستا سەجادی ناوی ئەو سەرچاوانەی نەهێناوە . کە ئەو سەرگوزەشتانەی لێوە وەرگرتووە .

وتاری ، مامۆستا نەجمەدین مەلا ، ــ لێرەدا . ئادەم بە ( کەی ) ناو دەبات ، ئەوجا ( کەی ) دەبێ بە ( کاکە ) بۆ پیاوو بۆ ژنیش دەبێ بە کەیبانوو . ئەوجا دێ ( کەی ) بەسەر ( ئەهریمەن ) دا سەردەخاتو نیشانەی سەرکەوتنەکەی بە ئاگر دیاری دەکات ، ئەم ڕووداوەش دەباتە شاخەکانی ڕەواندزەوە(٤) .

دوکتۆر محەمەد نوری عارف (٥) لە وتارێکدا دەربارەی نەورۆز بە ناونیشانی (کاوەی ئاسنگەرو زوحاکو نەورۆزەوە) نووسیویەتیو وا دەریدەخات کە جەژنی نەورۆز؛زوحاك وکاوەی کارێکی ئەفسانەیەو سەرو بنی ڕاستیی ئەوەی نی یە کە هەرگیز پەیوەندیی بە گەلی کوردەوەو نەورۆزەوە هەبێ .

عەبدولڕەحمان مزووریش(٦) لە پاشکۆی عیراقی ژمارە (١٢ــ١٣) ی ساڵی (١٩٧٨) دا ، وتارێکی بە ناونیشانی : ( نەورۆزو هۆزانڤانێت کرمانجی یا ژووری ) بڵاوکردووەتەوە تیایا وێنەی شیعری جەزیریو خانی دەهێنێتەوە . کە گوایا شاعیری ئەو ناوچەی بادینانە لە بارەی نەورۆزەوە گۆرانی یان هۆنیوەتەوە ..

نووسەری ئەم باسەیش . لە پاشکۆی هاوکاریی

رۆژی ١٢ـ٣ـ١٩٧٨ دا وتارێکی بە ناونیشانی : ( وشەیەك دەربارەی نەورۆز ) ەوە بڵاوکردووەتەوە ، لێرەدا نووسەر بۆیە . بەلای بەسەرهاتی مێژوویی نەورۆزدا دەچێ چونکە بەراووردی تەقویم (رۆژنامەی) دینی و دنیایی کردووەتەوە چاوو کردوویەتی بە بنچینەی باسەکەی .

٢ ـ شیعرو هۆنینەوە :ـ

زۆربەی شاعیرەکانمان . تا سەرچاوە پێمان نیشان بدا . گۆرانییان بە نەورۆزدا هەڵداوە ، لاواندوویانەتەوە . شیوەنیان کردووە . خەڵکیان گەش کردووەتەوەو هانیان داوە بۆ یادکردنەوەو ئاهەنگ‌گێڕان بەو بۆنەیەوە .

وێنەی شیعری شاعیرە کۆنە کلاسیکییەکانمان ، وامان پێ رادەگەیەنن کە نەورۆز ، واتای رۆژی نوێ دەدات . واتای سەری ساڵ دەدات ، یاخود واتای سەرەتای ساڵی نوێ و ژیانەوەی رووەك و ژین دەدات . واتای داکەوتنی گەرمایی و بڵاوبوونەوەی تینی گەرمی تواندنەوەی بەفرو بەستەڵەك دەدات ، بەڵام لە شاعیرەکانی چەرخی بیستەممان بەم لاوە . بەرەو زیاتر وردبوونەوەو لێکۆڵینەوە چوون .. ئەوەی کە لەو بارەیەوە دەستی کەوتووە . ئەوەی کە چووە بە پیرییەوەو بە ڕاستی زانیوە ، بە ئاوازو هۆنراوە گۆرانی بە نەورۆزدا وتووە . ئەگەرچی زۆربەیان لەسەر بیرو سەرگوزەشتەی ساکاری پێشوو دەڕۆن .

لێرەدا بۆ ئەم مەبەستەی سەرەوە وێنە شیعری ( جزیری ) و ( خانی ) و ( سەیدای هەورامی ) و ( مەولەوی ) و (پیرەمێردی نەمر) و هی ئەو شاعیرانەی کە گەشەیان لە قوتابخانەی نەورۆزی پیرەمێردی نەمردا کردووە . بە وێنە دەهێنینەوە(٧) :

بۆ وێنە مەلای جزیری ، جەژنی نەورۆزی بە جەژنی خۆشی و دڵسافی و دڵپاکی سەرساڵی دادەنێ، بۆیە دەڵێ

**« ئەف نارو سیقالا دلە**
**دائیم لوێ قالا دلە**
**نەورۆزو سەر سالا دلە**
**وەختێ هلتێن ئەو سیراج »**

دیوانی جزیری ( ل ـ ١٧٨ ) (٨)

خانی جەژنی نەورۆز بە نەریتێکی دێرینی کوردی سەرژمێر دەکات ، بۆیە دەڵێ :

**« کو عادەتێ پێشیێ زەمانان**
**ئەو بو لهەمی جهو مەکانان**
**وەختێ وەکوو شەهسوارێ خاوەر**
**تەحویل دکر دهاتێ ئازەر**
**یەعنی کو دهاتە بورجا سەرسال**
**قەت کەس نەدما بمەسکەن و مال**
**رۆژا کو دبویە عیدا ( نەورۆز )**
**تعظیم ژ بو ، دما دل ئەفروز**
**سەحراو چیمەن دکرنە مەسکەن**
**بەیداو دیمەن دکرنە گولشەن »**

(مەم و زین ، ڕۆدنکۆ ـ ٥٢ـ٥٣)(٩)

سەیدای هەورامی . نەورۆز بە سەردەمی ژیانەوەی گوڵ و گوڵزارو تواندنەوەی سەهۆڵ و بەفربەندان لە قەڵەم دەدا ، بۆیە دەڵێ :ـ

**« نەورۆز گوڵ خێزان ، نەورۆز گوڵ خێزان**
**وادەی وەهارەن ، نەورۆز گوڵ خێزان**
**بەدەن کافووران ، خاڵ خوردە ڕێزان**
**پۆشان مایە عەتر ، بۆی عەنبەر بێزان**
**نەورۆز گوڵ چاسووس ، گوڵان تازەن**
**وەهار « کیانان » مزانی وازەن**
**....**
**....**
**قاسد نەورۆزان ، نەپای هەردەوە**
**یەك یەك بەر ئامان نە تۆی پەردەوە**
**هێمای خۆ زمستان ، تەشریف نەبەردەن**
**نەورۆز گوڵ موژدەی وەهار ئاوردەن**
**مزانی بلۆ ، زومستان وێەرد**
**تەختی یەخبەندیش ، هەوادا بە گەرد »**

(دیوانی سەیدای هەورامی)(١٠)

مەولەوی . نەورۆز . بە سەرەتای دەمی هاتنی بەهار دەزانێ بۆیە دەڵێ :

**« سەبزەن ، سۆسەنەن ، نەورۆز گوڵانەن**
**کەمەرەن ، هەردەن ، ملەن ، کەلانەن**
**....**
**....**
**نیشانەی ، نەورۆز ، وادەی ، وەهارەن**
**یا نەشئەی ئامای نامەی نیگارەن »**

دیوانی مەولەوی (ل ـ ٥١٤)(١١)

پیرەمێردی نەمر . جەژنی نەورۆز ، بە جەژنی دێرینی نەتەوەی کورد دەزانێ و وا دیارە بەتەواوی

شارەزای سەرگوزەشتەی مێژووی ڕووداوەکانی نەورۆزە . بۆیە دەڵێ :

**« ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە**
**جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشیو بە هاتەوە**

. . . . .

. . . . .

**ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد**
**مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوورو نزیك ئەبرد**
**نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە**
**لاوان ، بە عەشق ئەچوون بە بەرەو پیری مەرگەوە(١٢)**

شێخ سەلام ، وەختێ کە نەورۆز دەلاوێنێتەوە ، دەچێتەوە سەر ڕووداوەکەی (کاوە) و (زوحاك) . بۆیە دەڵێ :

**« ئا ئەم ڕۆژە بوو کاوەی کوردی کورد**
**مێشکی زوحاکی بە چەکوش وورد کرد »(١٣) .**
**(بەیان ، ژ ، ٢٣ی ساڵی ١٩٧٥)**

دوکتۆر ئیحسان ـ فوئاد ، نەورۆز بە ڕەمزی شۆڕش دەزانێو دەیباتەوە سەر لاپەڕەی مێژوویی گەلی کورد ، کە دەڵێ :

**« لاپەڕەی مێژووی وڵاتمان میللەتی جووڵانەوە**
**یادی خوێنی سوورو گەشی دیارە بە رووی لاوانەوە»(١٤)**

شێخ نووری شێخ سالح ، نەورۆز بە ڕەمزی تێکۆشانی نەتەوەی کورد دەزانێو وای لەقەڵەم دەدا ، کە تیشکی ئازادی لێ دەبێتەوە ، بۆیە دەڵێ :

**ئاگری نەورۆز بە گیانو بە دڵ ئەبێ وا خۆش کرێ**
**گەر بەخوڕ دیجلەو فوراتی بێتەسەر نەکوژێتەوە(١٥)**

جگەرخوێن بە بیری زمستان تواندنەوەی سەهۆڵبەندانو جەژنی کورد ، نەورۆز ، دەهێنێتەوە یاد ، بۆیە دەڵێ :

**« نەورۆزو بهارە . ئادارە ، ڕەنگینە**
**دەمو بەنگا ژینە زڤستان وەك ڕۆژە**
**ئادارە ، نەورۆزە دوژمنا دەرد دایە**
**سەر ساڵا کوردایە ئەڤ مەها نیسانێ**
**جەژنا کوردستانێ خەملو خێزا وەلات**
**سەر سەرو چاڤا هات(١٦)**

مامۆستا عەردی ، بە گۆرانی ، بە تەواوی

**مێژووی دێرینی کوردو نەورۆزی ڕوون دەکاتەوە ،** کە دەڵێ :

**« لە رابووردوویەکی دوورا ، ستەمکارێکی بەدکار**
**گەلی کوردی لە ئاسۆرا سزادابوو بە زەبری دار**
**بە چەشنی گەردەلوولێ ڕای ئەپێچا گیانی لاوانی**
**بەرەو قوڕگی چڵێسی ئەژدەهاکی پیسی سەرشانی**
**گەلێ ماڵی بە قوڕ گرتو گەلێکی کردە وێرانە**
**لەلای وابوو کە بێشەی خاڵی یە ئەم خاکی شێرانە**
**بەڵێ ئەو نەیئەزانی بێشەیەك ئاوا پڕو چڕ بێ**
**لەشێر خاڵی نی یە کاتێ کە زاڵم کاسەکەی پڕ بێ**
**بەڵام کاتێ بە خۆی زانی کە نرکەو نەعرەتەی لاوان**
**بە سەرکردایەتی کاوەو بە پشتی ڕۆڵە کوژراوان**
**دڵی هێنایە لەرزینو بەشی یەك تاقە هەڵمەت بوو**
**تە خۆیو ئەژدەهاکو تەختو تاراجی لەتو پەت بوو(١٧)**

دیارە مەبەستی هێنانەوەی نموونەی پەخشانو نموونەی هۆنراوە ، بۆ ئەوەیە کە زۆر نەبێ کەم کەرەستەی مێژوویی سەرگوزەشتەی ڕوو داوەکانی نەورۆزمان بە دەستەوە بدا ، بێگومان لەم بارەیەوە زۆر سوودمان وەرگرت ، ئەویش ئەوەیە کە چەند شتێ . یان چەند ڕووداوێ ، زۆر بە دیاریو بە مەزنی ناویان براوە . کە ئەوانیش ئەمانەن : ـ ئاگر ، کاوە نەورۆز ، زوحاك ، جەژنی بەهار .

بەلای هەموومانەوە ڕۆشنە . کە هیچ شتێ . واتە : هیچ جۆرە ڕازێ ، یاخود هیچ جۆرە سەرگوزەشتەیە ئەگەر بنچینەیەکو شوێنەوارێکی نەبووبێ لە خۆیەوە نەکەوتووەتە نێو ناوانەوە ، بۆیە بە پێویستی دەزانم کە بە پێی توانا بە شوێن مێژووی دێرینی ئەمانەدا بگەڕێم تاوەکوو بتوانین زۆر نەبێ ئەم وشەیەکی ڕۆشن بخەینە بەردەست خوێنەران .

**ئاگر : ـ**

دیارە ، لای هەمووومان ، کە ئاگر ڕووناکیی هەیە ، توانای ئەوەی هەیە دنیای تاریك ڕۆشن بکاتەوە . گەرمایی هەیەو توانای ئەوەی هەیە هەموو شتێ گەرم بکاتەوە . کە واتە ، عونسوری پاریەدەری بەردەوامیی ژیانە ، چونکە . تەنێ ، ئەگەر گەرمیی تێدا نەما . گیانو ژیانی تیادا نامێنێ . کە وابوو ( ئاگر ) بە ڕۆشناییو بە گەرمیو بە پاکیو شۆڵەی گڕیدا بنەماکێکی پاکی بنچینەییە . بنەماکێکی بێگەردی ئەوتۆیە کە بە هۆی تینی گەرمیەکەیەوە توانای پاککردنەوەی زۆر شتی ناپاکی هەیە کە لە نێو ساردیو یەخو سەهۆڵبەندانو تاریکیو لێڵیو پیسیدا خۆیان شاردووەتەوە .

دیارە ئەگەر ئەوە ئاگر بێ دەبێ وەك ڕەمزێکی پاکی ڕۆشنکەرەوە . وەك زیندوو کەرەوەو ڕواندنەوەی ژیان ، بە وەچەیەکی ڕۆژ تەماشا بکرێ .

ئەو ڕۆژەی کە دنیا ڕوناکو گەرمو شۆڵەدارو ڕۆشن دەکاتەوە ، ژیان سەر لەنوێ دەژێنێتەوە ، چونکە هەر وەك زانست پێی ڕاگەیاندووین . تیشکی خۆر وەك شۆڵە ، وەك تینی گەرمایی ، ڕایەڵەیەکی بێوێنەی گەورەی بەردەوامی ژیانە ، لە مرۆڤ ، لە مەڕو ماڵات . لە زیندەوەری دیکەی وەك خشۆکو مارو مێروو هەروەهاش لە ڕووەکدا .

زانست تێی گەیاندین . بە شێوەیەکی ڕۆشنانەو زانیارییانە کە تیشکی خۆر ، ڕۆژ ، گەرمایی دەبێ بە هۆی خواردنو دروست کردنی ڕووەکو دەبێ بە هۆی بەردەوامیی ژیانو گەورەبوونیو بە هۆیەوە توانای هێنانە بەرهەمی بەری دەبێ . کە سەرچاوەیەکی گرنگی خۆراکی گیاندارە بە هەموو جۆرەکانیەوە .

بێگومان سوودی خۆرو سوودی تیشكو تینو گەرمیی لە ژماردن نایەت بۆیە سەرپاکی ئایینەکان . لە ڕووی زانستەوە بە عونسرێکی بنیاتنەری گرنگی کەونیان داناوەو بۆیە سەرپاکیان دەست بەسنگەوەن بۆ ڕێزگرتنیو بۆبەپیرۆز زانینی .

کە وابوو ئەگەر نەتەوە ئێرانییەکانو نەتەوەکانی دیکەی سەرزەمین سوودی ئاگرو تینی گەرمای ئاگر لە ڕیزێکی پیرۆزدا دابنێن . بەلای منەوە هیچ جێگای ڕەخنە لێگرتن نییە ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە دەبێ جێگای ڕێز لێگرتن بێ ، چونکە ئەمە ئەگەر سەرەتایەکی ڕۆشنی زانستی نەبێ ، دەبێ چی بێ ! ئەگەر زانیمان هەر یەکێ لەو نەتەوانە خوا دەناسنو زۆر دووریش لە بتپەرستییەوەو هەر یەکە پەیامنێرێکی تایبەتیشیان هەیە .

بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەمەو ڕۆشنکردنەوەی هەندێ بیرو ڕای دیکە کە پەیوەندییان بە پیرۆزیی ئاگرو شۆڵەیەوە هەیە . دیارە دەبێ بۆ دێرین زەمان بڕۆینەوە ، بۆ ئەوەی ئەختێ شت دەربارەی ئـەو ئاگرانەوە بزانین .

لەنێو گەلانی دەورووپشتی گەلە ئێرانییەکاندا وا باوە ، کە گەلە ئێرانییەکان . هەر لە دێرین زەمانەوە ئاگریان پەرستووە ، بۆیە بە پیرۆزیان زانیوەو یادکردنەوەی ئێستاشیان هەر جۆرێکە لەو ئاگر پەرستییە !

تا ئەمەی سەرەوە لە لایەکەوە . لە لایەکی ترەوە . گەلە ئێرانییەکان خۆیانو مێژووی دێرینیانو ئەو سەرچاوە باوەڕپێکراوانەی کە لەو ڕووەوە هەن بە تەواوی بە پێچەوانەی ئەم ڕازە بیروباوەڕ شوێنانەوەن .

هەندێ سەرچاوە ، وا دەگێڕنەوە کە لە سەردەمی کڵاوی ( جەمشید )دا تۆفان هەڵساوەو ئەویش لە هەموو جۆرە شتێ جووتێکی باشی نێرو مێی کۆ کردووەتەوە .. پاش نیشتنەوەی تۆفان . سەرما چووەتە نێو تەنیانەوەو زۆری بۆ هێناونو لەسەر زەمین لە جێگایەکی شاخاویدا ئاگرێکی گەورەیان کردووەتەوەو خۆیان پێ گەرم کردووەتەوەو مەترسیی سەرماو زوقمو سۆڵە لە نێو تەنو لاشەیاندا باری کردووە لەو ڕۆژەوە . ئاگریان بە پیرۆز زانیوە(١٨) .

هەندێکی دیکەش ، دەڵێن وا دەگێڕنەوە ، کە نەتەوە ئێرانییە دێرینەکان هەر لە ... شۆو ڕەوتو کۆێزانەوەدا ، لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر ، بوون، دیارە لەبەر بوونی چاڵو چۆڵو چەمو دۆڵو بەرزو نزمیو شاخو داخو دارو دەوەنو چەمو چوخو ، نیشانەی ئارامگرتنو ڕێڕەو کردنیان ، ئاگر کردنەوە بووە، پاشان وایشی لێهاتووە ، هەر نەتەوەیەك . خۆی وەك یادکردنەوەیەك بەتایبەتی پاش نیشتەجێبوونی ئاگری تایبەتیی خۆی هەبووەو بە پیرۆزی زانیوە (١٩) .

سەرچاوەیەکی تر دەڵێ : ئەوانەیە ئاگرکردنەوەی شەوی نەورۆز لەسەر کڵاوی ( جەمشید ) ی پێشدادیدا بووبێ (٢٠) .

ئاگر . لە ئاوێستادا . بە شتێکی پیرۆز لە قەڵەم دەدرێ . ئەویش لەبەر ڕۆشنی و لەبەر تینی گەرمیدا ، بەو نیازەی ئەهرۆمزدە ( یەزدان ) شۆڵەی ڕۆشنایی ( نوور ) لێدەدرەوشێتەوەو پەیامبەریش ( زەردەشت ) بەناو خەڵکی سەر زەویدا بڵاوی دەکاتەوە . بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای تاریكو لێڵو ونبوو ، بە کورتی شۆڵەی ( نوور ) لە پەیامبەردا ( تەجسید ) بووەو کە ئەوسا پێیان وتووە ( ئاتەر = ئاگر ) . ئەمە شۆڵەی نووری خوایە .

ڕۆشناییو تاریکی دوو بنەڕەتی دژوارن . ( یەزدان )و ( ئەهریمەن )یش دوو هێزی دژوارن ، هەمیشە لە زۆرانبازیدان ، خوا دروستکەری ڕۆشناییو نوورە . شۆڵەی پرشنگداری بە خەڵکی ئیماندار دەبەخشێو هەمیشە ڕێگای ڕاستی لەلای ڕۆشن دەکاتەوە . شەیتانیش تاریکییە ، ڕێگا ون کردنە ، خەڵەتاندنە . درۆزنییەو ناپاکی بەرپاکردنە ، شەڕە

...هاته . به هۆی بوونی جیهان‌و خه‌ڵكی جیهان‌و ئه‌م سه‌ر زه‌مینه‌و(٢١) بوونی هـــه‌مه جۆر گیانـــه‌وه‌رو زینده‌وه‌رو رووه‌كی ئـــه‌م سه‌ر زه‌مینه(٢٢) دژواری‌یان بووه .

نه‌قش‌و نقووشه كۆنه‌كان . به تایبه‌تی ( پارە ) وای ده‌رده‌خه‌ن . كه ئاگر هه‌میشه ره‌مزی رۆشنایی‌و رێكاپیشانده‌ری ( شاهـ )ە ئێرانی‌یه‌كان بووه . لـــه زۆربه‌ی ئه‌و پارچه پارانه‌دا وێنه‌ی ( شاهـ ) دیاره‌و له پشت سه‌ریه‌وه مه‌شخه‌ڵی ئاگر بۆی ئاماده‌كراوه . له‌گـــه‌ڵ به‌بداخی ( دره‌فتش كاوه )دا مێژووی ئـــه‌م نه‌قش‌و نقووشانه‌ش بۆ چه‌رخی سێیه‌می پێش زایین ده‌گه‌رێنه‌وه (٢٣) .

نه‌قشه‌كانی تاقه‌وسان . كه ده‌گه‌رێنه‌وه بـــۆ سه‌رده‌می سه‌رو كلاوی ( ئه‌رده‌شیر ) ، مێترا ، خـــوای رۆژ له پشت شانی ( شاهـ )ه‌وه وێستاوه‌و پرشنگی شۆڵه‌ی به هه‌موو لایه‌كدا بلاوده‌بێته‌وه‌و ئه‌و كاتـــه پیشان ده‌دا كه شاهـ زۆرو سامانی له ( ئه‌هرۆمه‌زد )ه‌وه وه‌رده‌گری .

له جزمێكی ئاوێستادا كه پێی ده‌وترێ ( یه‌شت ) پێنج جۆره ئاگری پیرۆز هه‌ن ( یه‌شت ، ل ١٧ ـ ١١ ) . كه ئه‌وانیشـــ(٢٤) بـــه‌م جـــۆره‌ن :

١ ـ ئاگری به‌هرام . ئه‌و ئاگره‌یه . كه خه‌ڵكی هه‌میشه سوودی لێ وه‌رده‌گرن ٢ ـ ئاگری نێو ته‌نی مرۆڤـــو مه‌رو مالات ٣ ـ ئاگـــرێ تینی لـــه رووه‌كدا ده‌ست ده‌كه‌وێ ؛ ٤ ـ ئـــه‌و ئاگره‌ی كـــه له هه‌ورە تریشقه‌دا هه‌یه . ٥ ـ ئاگری زۆر گرنگ . كه ئه‌ویش ئه‌وه‌یه له ئاهۆرامه‌زده‌دا . له به‌هه‌شتدا ده‌سووتێ‌و توانای رژاندنی كامه‌رانی‌ی هه‌یه به‌سه‌ر ئه‌و ( شاهـ )ە

راسته‌قینه ئاری‌یانه‌دا كه به‌راستی خزمه‌تی ئـــه‌م نووره ده‌كه‌ن .

ئه‌مه جگه له‌وه‌ی . كه هه‌ندێ خاڵی بنچینه‌یی دینی زه‌رده‌شتی هه‌ن . ئامۆژگاری به‌وه ده‌كه‌ن . كه ریزی پیرۆزی‌ی له عونسوره پێكهێنه‌ره‌كانی سروشت‌و كه‌ون بگیرێ‌و یه‌كێ له‌وانه‌ش ( ئاته‌ر = ئاگر )ە(٢٥) .

**جۆری ئاگری پیرۆز : ـ**

وه‌ك ده‌گێرنه‌وه ، سێ جۆره ئاگری پـــیرۆز هه‌بووه . هه‌ره كۆنترینیان له‌و وه‌خته‌دا بووه ، كـــه كۆمه‌ڵێ خه‌ڵك له سه‌رو كلاوی ( شاهـ ) ێكی خه‌یاڵی‌دا ( ته‌خموورب ) له ناوچه‌ی ( خۆنیرۆس )ه‌وه بۆ شه‌ش ناوچه‌ی دیكه گوێزاویانه‌ته‌وه ، كه هه‌رگیز لـــه توانای مرۆڤی ئاسایی‌دا نه‌بووه . گوایه ئه‌م گوێزانه‌وه بـــه سواری گای ( سه‌رسانۆخ ) بووه . وا رێك ده‌كه‌وێ شه‌وێكیان سێ ئاگری هه‌ڵگیرساو كه له سه‌رپشـــتی ( گا )كه‌وه بوون بكه‌ونه ده‌ریاوه به‌ڵام . ئه‌و ئاگرانه . هه‌روه‌ك گیانی زیندوویه‌تی‌یان تێدا بێ . ئاكوژێنه‌وه‌و سه‌رله‌نوێ داده‌گیرسێنه‌وه‌و دنیا رووناده‌كه‌نه‌وه له پاشا ییم ( جیم ) یاخـــود ( جـــه‌مشید ) خـــه‌لیفه‌ی ئه‌و ( شاهـ ) ە یه هاتووه‌و خانوویـــه‌ك بۆ یه‌كێ لـــه‌م ئاگرانه‌ی كه نێوی ئاگری ( فه‌ربه‌غ ) ە دروست بكات ، كه ئه‌م خانووه ده‌كه‌وێته سه‌ر شاخی ( خوره‌مه‌ند ) له ( خوارزم ) دا(٢٦) ...

سه‌رگوزه‌شته‌یه‌كی تر رامـــان بۆ ده‌گێڕێته‌وه كـــه دینی مـــه‌زدی سێ جـــۆره ئاگری هه‌بووه‌و هه‌ریه‌كه‌یان تایبـــه‌تی بووه به چینێكه‌وه : مه‌به‌ستی چینی كۆمه‌ڵایه‌تی‌ی ئه‌و سه‌رده‌مه‌یه .

له لایه‌كی دیكه‌وه ئه‌وه‌مان بۆ ده‌گێڕێته‌وه كـــه زه‌رده‌شت سێ كـــوڕی هه‌بووه‌و هه‌ریه‌كه‌یان كوڕی ژنێ بووه‌و ئه‌و ژنه‌ش ســـه‌ر به چینێ بووه ، واته . ئاگری = ئازه‌ر ( فه‌ربه‌غ ) كه ئاگری تایبه‌تی‌ی پیاوه دینی‌یه‌كان بووه . ئاگری ( گه‌شناسب ) تایبه‌تی بووه به پیاوه جه‌نگاوه‌ره‌كانه‌وه . ئاگری ( به‌رزه‌ین مه‌هر ) تایبه‌تی بووه به جووتیاره‌كانه‌وه(٢٨) .

هـــه‌ندێ سه‌رچاوه‌ی تر ئه‌م ئاگرانه بۆ پێش سه‌رده‌می زه‌رده‌شت ده‌به‌نه‌وه واشی له قه‌ڵه‌م ده‌ده‌ن . كـــه نزیكـــه‌ی ( ده ) ئاگـــر بووبێ‌و ( ده ) خانووی ( ئاویرگا ) شیان(٢٩) هـــه‌بووبێ‌و هـــه‌ریه‌كێ له‌و ( ئاویرگا ) یانه ناوێكی تایبه‌تی‌یان هه‌ڵگرتبێ .

سه‌رچاوه‌ی دیكه . وا ده‌گه‌یه‌نێ كه دروستكه‌ری ئه‌و سێ ئاگـــره پیرۆزه . (ئاهـــۆرامه‌زدا) یه‌و ده‌می دروستكردنیان بۆ ده‌می دروستبوونی دنیا ده‌گه‌رێته‌وه‌و نێویشیان ( خرداد . گشناسب ، بورزین مه‌هر )ە(٣٠) .

مه‌به‌ســـت له دروســـتبوونی ئاگری یه‌كه‌م . ئه‌وه‌یه . كه پیاوه دینی‌یه‌كان زۆر شـــاره‌زای دین‌و خواپه‌رستی ده‌كات‌و توانای لێكۆڵینه‌وه‌ی بازی دینی‌یان زیادو به‌هێز ده‌كات . ئاگری دووه‌م ، توانای پیـــاوه جـــه‌نگاوه‌ره‌كان زیادو بـــه‌هێز ده‌كات‌و هونـــه‌ری جه‌نگاوه‌ری‌یان به‌رز ده‌كاتـــه‌وه . ئاگـــری سێیه‌میش توانای ژیری‌و شاره‌زابوون ، بـــه خاوه‌ن كێڵگه‌كان‌و جووتیاره‌كان ده‌دات بۆ ئه‌وه‌ی به‌رهه‌می زه‌وی‌و زاریان زۆرو به به‌ره‌كه‌ت بێ‌و ، له ئاوێستاش‌دا (زه‌رده‌شت) به پیاوی دینی‌ی یه‌كه‌م‌و به جه‌نگاوه‌ری یه‌كـــه‌م‌و بـــه

جووتیاری یەکەم لە قەڵەم دەدری(٣١) .

بەپێی ئەم هەموو سەرگوزەشتانەی کە گێڕامانەوە ئەگەر لە ناوەڕۆکو جەوهەریان ورد بینەوە ؛ بۆمان دەرکەوت . کە لە پێش بوونی دینی زەردەشتیدا ، دینی مەزدی هەبووەو پیرۆزیی ئاگری لا باو بووەو دینی – زەردەشت – یش پیرۆزیی ئاگری دووپات کردووەتەوەو . لەسەر بنچینەی ئەوەی کە (ئەهورەمەزدە خوا) نوورە ، ڕۆشنایییە ، ڕێگا پیشاندەرە بە نیسبەت ئەو کەسانەوە کە شوێنکەوتووی دینەکەینو پەیڕەوی پێدەکەن . ئاگریشو ڕۆشنایییش ڕەمزی ئەون ( یەزدان ) ن . بۆیە دەبێ پاڕانەوە لە خوا لە ژووری ( ئاویرگا ) دا بێ ، بۆ ئەوەی زیاتر سامی خوای لەبەرچاو بێ !

**گاوە :**

یەکێ لە جوزمەکانی ئاوێستا ( الفندیداد – فەندیداد ) ە . لە بەشی سێیەمیدا باسی پیرۆزیی بەروبوومو شیری ( مانگا ) دەکاتو دەڵێ(٣٢) : ئەو جێگایەی ئاوەدانیو بەختەوەر بێ ئەوەیە کە ئیمانداوەر لێی جێگیر دەبێو خانووی لێدروست دەکاو مانگاو مەڕو ماڵاتی دەبێو خێزانی دەبێو هەموو شتێکی لێ کەورە دەبێو پێدەگا کە ئەمە بەردەوامیی ژیانە ....

زەردەشتییەکان کە دەگەنە ( گا ) سڵاوی لێدەکەن . لەبەر ئەوەی کە ( گا ) خەیرداروخەیر بەخشە(٣٣) .

بەپێی هەندێ سەرگوزەشتەی دینی زەردەشتی ، وەختێ کە ئەهورەمەزدە بەسەر ئەهریمەندا سەردەکەوێ ، دنیا دروستدەکاتو ( گا ) ی یەکەم دروستدەکاو مرۆڤی یەکەم دروستدەکات .

( گاو ) ، لە ئاوێستادا ، بەواتای ( شاه ) و ( مەزن ) و ( بەهێز ) هاتووە ، کوایا ، لە سەرەتادا (کەی)* بووەو ئەوجا بووە –(پاش ئاڵو گۆڕی زمان)– بە ( گاو ) لە پاشدا ( کاوە ) ئەوجا ( کاوە ) .

کاوك ( کاوە )(٣٤) ئەو کەسە بووە . کە بەسەر ( زوحاك )دا لە دێرین زەمانەدا سەرکەوتووەوە خەڵکەکەی لە دەست زوڵمو زۆرو جەور سەرفراز کردووە . ئەو کەسەش کە ( کاوك ) = ( کاوە ) ی پێ وتراوە ، وا باو بووە کە ئاسنگەرەو نێوی بنەڕەتیشی ( ئافرەیدوون ) بووە(٣٥) ، لەبنەڕەتدا بۆ بنەماڵەی ( شاه ) ە ئێرانییە دێرینەکان دەگەڕێتەوە. لەبەر زیاتر ئازاییو لەبەر ئەوەیش کە پێستی ( گا ) وەك ڕەمزی سەرکەوتنو هێز کردوویەتی بەسەر

قوڵنگەکەیەوەو توانیویەتی بەسەر ( زوحاك ) دا سەرکەوێ(٣٦) (٣٧) .

مەسعوودیش هەر هەمان قسەی وتووە . تەماشای ( مروج الذهب ومعادن الجوهر . ل ٢٤٧ ) بکە(٣٨) .

پاش ئەم سەرگوزەشتانەی سەرەوەو بەراورد کردنیان ، بۆم دەرکەوت کە ( ئافرەیدوون ) ناوێ وەك سەرکردەیێ توانیویەتی بەسەر زاڵمێكو دوژمنێ بە گەلێكدا سەربکەوێو ئەو گەلانە سەرفراز بکات کە لەژێر جەوریدا بوونو ئەو ( ئەفرەیدوون ) ەش یان لەبەر ئەوەی کە لە بنەماڵەی کەیانییە ، یاخود لەبەر ئەوەی کە بەیداخەکەی پێستی گا بووە ، گوایە ڕەمزی هێزو سەرکەوتنو مەزنییە . یاخود لەبەر بوونی مەردیو هۆیەکە ، ناوی لێنراوە (گا = گاو ، گاوە) .

کردنی ( درەفشی گاویان ، بە بە[illegible] کە لە ئێرانییەکانو مانەوەی ئەو ڕەمزە . ئەو بەیداخە ، بەو شێوە کۆنەیە . تا سەردەمی ئاخرو ئۆخری حوکمڕانی ساسانییەکان ، تا سەرکەوتنی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس بەسەر ڕۆستەمدا سەرکردەی سوپای ئێرانییەکان لە جەنگی قادسیەدا لەساڵی (١٥)ی کۆچیدا ئەو ڕایەمان بۆ بەهێز دەکات (٣٩)

**نەورۆز :**

سەرانسەری گەلە ئێرانییەکانو گەلانی دیکەی جیهانیش بە تەنگ یادکردنەوەی . کۆتایی ساڵی رابوردوو و سەری ساڵی نوێوەن . پێش ئەوەیش بۆ ئەوە بچین کە سەرچاوەکان دەربارەی نەورۆز وەك واتای خودی ئێوەکەی دەیڵێو دەری دەخاو وتوویانە . پێویستە ئەوە بخەینە بەرچاومان . کە گەلێ لە گەرمیاندا ، ڕۆژی یادکردنەوەی سەر ساڵی ، یان سەرەتای ساڵی نوێی لە یادکردنەوەی گەلێکی کوێستانی جیاوازە ، ئەگەر بۆ وێنە سەری ساڵ یاخود سەرەتای ساڵێ مانگێکی بۆ دیاری بکرێ .

مەسعوودی دەڵێ : زۆربەی خەڵك وا بە بیریانەوە دەچێ کە ( نەورۆز ) وەك ڕووداوێكو سەرەتای یادکردنەوەی ، لەسەرو کڵاوی ( جەمشیدە )وە (٤٠) ڕووی دابێ .

یۆنانییەکان ، بە شێوەیەکی ڕاست تر گریکەکان ، بەهاریان بە یەکەم مانگی ساڵی نوێیان داناوەو بەم بۆنەیەوە . واتە : هاتنی گەرماییو زیندووبوونەوەی ژیان بەسەرچوونی سەرماو سۆڵەو زیندە بە چاڵ کردنی یەخبەندانو سڕو مرداری ، مهرەجانیان کردووە، تەنانەت شانۆیان بەم بۆنەیەوە پێشکەش بە گەل

کردووه (٤١) . فیردەوسی ، لە مەلحەمەکەیدا دەلێ : سەرکەوتنی ئافرەیدوون بەسەر زوحاکداو نیشتنە سەر تەختیو کۆکردنەوەی خەلکی زۆر لە مەجلیسەکەیدا . بە خشینی پارەو خواردن ، بەسەر کەسانی ئەو مەجلیسەداو بە درێژایی ئەو ئێوارەیە تاوەکو رۆژهەلات بە جەژنی میهرەجان ناو نرا(٤٣)

ئەوەی کە روونە ، گەلە ئێرانییەکان هەر لە دێرین زەمانەوە جەژنی سەرەتای دەستپێکردنی سالی نوێیان هەبووە ، هەروەها جەژنی کۆتایی سالی بەسەرچوویش .

دەربارەی مەغزاو جەوهەری ئەم جەژنیشە ، هاتنی سالی نوێیە ، زیندووبوونەوەی رووەکە ، ژیاندنەوەی مارو مێرووو ، پەرەسەندنی تینی گەرمایی . زۆربوونی رۆشنایی ، لاچوونو تواندنەوەی بەفربەندانو سەهۆلبەندانو سەرماو سۆلەو مرداریو مرداربوونەوەو لەکەلککەوتن ـ ٥ . یان یادکردنەوەی رووداوێك کە نیشانەی سەرکەوتنی گەلێکە ، کە بەسەر زولمو جەوردا ، سەرکەوتووە .

نیشانەی رۆژی نوێیەتی ، بەسەر رۆژی رەشدا ،

لە حالەتی یەکەمیاندا ، دەبێ سەرەتای مانگێك بێ کە بۆ دەست پێکردنی سال دیاری کرابێ ، ئەویش لای سەرپاکی گەلەکانی جیهان بەهار بووە. دیارە بەهار لە گەرمیاندا ، زوو تر دێتە بەرەوە تاوەکو کوێستان، بەم پێیە ، لە نێوان بەهاری ناوچەی ( پارس ) کە پارسەکان لە دێرین زەمانەوە تیایا نیشتەجێ بوونو لەوەی ناوچەی میدیادا جیاوازی هەیە ، کە کەوتووەتە کوێستانێکی تەواوەوە بە پێچەوانەی ناوچەی پارسەوە کەوا لە ناوچەیەکی گەرمیانیدایە .

لە حالەتی دووەمدا ، ئەگەر بۆ یادکردنەوەی رووداوێ بێ ، وەك ئەوەی ئافرەیدوون ، دەبێ لە رۆژێکی مانگێکدا ، رووی دابێ . بۆ ئەمەیش دەبێ ئەوە بخەینە بەرچاومان ، ئایا ئەو مانگانە لەو تەقویمەدا ( ٣٠ ) رۆژن ، یان چی ؟ ئایا سالی ئەو تەقویمە (١٢) مانگییە ؟ یان چۆن ؟!

بێگومان ، ئەگەر سال (١٢) مانگ بێو مانگیش (٣٠) رۆژ بێ ئەو وەختە وەختی رووداوەکە دەگۆردرێ . خۆ ئەگەر سالیش دوازدە مانگ بێو ژمارەی رۆژەکانی سالیش ( ٣٦٥ ـ ٣٦٦ ) رۆژ بێ ئەوا شتێکی دیکەیە ، جا بۆیە پێویستە ئەوە بەرینە بنجینەو رۆشنی بکەینەوە .

ئەوەی کە زۆر جێگای بروا بێو سەرچاوە بەدەستیەوە بدا بۆ سەردەمی ساسانیەکان دەگەرێتەوە . کە لە سەرو کلاوی دەولەتە جۆر بە جۆرەکاندا . جەژنی هەمە جۆر هەبووەو یادکردنەوەی هەر جەژنێ چەند رۆژێکی تایبەتیی هەبووە .

ئەگەر بێتو وەختو وادەی ئەو جەژنە ، لە دەولەتێکدا لەگەل وەختو وادەی هەمان جەژن لە دەولەتێکی دیکەدا بەراوورد بکەین ـ تەنانەت . لە سەرو کلاوی شایەکەوە بۆ شایەکی تر ـ جیاوازیی هەیە .

کەوابوو دوو تەقویم هەبووە : یەکێکیان تەقویمی دینی بووەو ئەوی دیکەیان تەقویمی دنیایی ، یاخود سیاسی . ئەگەر دینو دنیا یەکی بگرتابایە . ئەو وەختە جێگای جەژن ئالو گۆری نەدەبوو ، ئەگەر بەپێچەوانەشەوە ببوایە . بێگومان ئەویش بە پێچەوانەوە دەبوو .

جەژنی هەرە گرنگی ساسانیەکان . جەژنی گشتو کال بوو لەگەل ئەوەشدا جەژنی تریشیان هەبوو . وەختێ کە ( شاه ) ئەو دینەی بە دینی رەسمی قبوول بکردایە ، ئەو وەختە ( دین )و ( دنیا ) یەکیان دەگرت . هەردوو تەقویمەکەیشو جەژنەکانیش بە دینیو بە رەسمی لە یەك کاتدا دەکران .

بێگومان لەم کاتەدا ( یەکگرتنیان ) یادکردنەوەی سەرپاکی جەژنەکان شێوەی گەلیان دەگرتەوەو یادکردنەوەکە دەبێ بە شێوەیەکی میهرەجان .

شایەنی باسە ، هەریەکێ لەم جەژنانە ، ناوێکی تایبەتیی هەبووە ، بۆ وێنە : فلان جەژن ، بە ناوی فلانە رووداوەوەیە ، کە لە سەرو کلاوی ئەفرەیدووندا رووی داو ئیتر بەو جۆرە .

سالی دینیی زەردەشتی (١٢) مانگەو هەر یەکێ لەو مانگانە ( ٣٠ ) رۆژە . هەر یەکێ لەو مانگانەش ناوێکی پیرۆزی پێوەیە(٤٤) .

جەژنە زەردەشتییەکان ( ٦ ) شەشن ، ماوەی هەر جەژنەش نزیکەی (٥) پێنج رۆژێکی خایاندووە(٤٥) .

سەرەتای سالی ئێرانییەکان ، پێش حوکمی ساسانییەکان ، مانگی ( مەهر ) بوو ، واتە لە سەرەتای مانگی ( مەهر )دا دەستی پێ دەکرد . جەژنی میهرەجانیش لە یەکەم رۆژییەوە دەستی پێ دەکرد ، بەلام لە تەقویمی دیکەشدا ، سەرەتای مانگی بەهار سەرەتای سالی نوێ بوو و جەژنی میهرەجانیش لە یەکەم رۆژیەوە دەستی پێ دەکرد ، ئەو مانگەیش کە

بە یەکەم مانگی بەهار درایە قەڵەم نێوی ( ئەهرۆرمەزدە ) بوو .

پاشان . سەرچاوەی بڕوایێکراو وامان بۆ روون دەکەنەوە کە هەردوو تەقویمەکە بوون بە یەك ، واتە ( دین و دنیا ) یەکیان گرت _ ( تەماشای پیشکنین ( جۆتشمد )و ( نولدکە ) بکە ) _ ئەنجا مانگی ئەهرۆمزدە بوو بە یەکەم مانگی بەهار .

جەژنی نەورۆزیش کە جەژنێکی گەورەی گەلە
١ ئێرانییەکان بوو وادەکەشی رێککەوتی کۆتایی ساڵی کۆن و سەرەتای ساڵی نوێی دەکرد ، لە گەرمیان و کوێستاندا ( پارس )و ( میدیا )دا یەکیان گرت و بەو جۆرەش جێگیر کرا کە ساڵ (٣٦٥ـ٣٦٦) ڕۆژە .

ئا لەم جەژنەدا ؛ هەموو کەسێ پشووی بووە ؛ ئا لەم وەختەو وادەدا ، لە سەرەتای یەکەم رۆژیەوە بەیانیی زوو خەڵك بۆ کانیاوەکان ، جۆگەکان ، ئەستێرگەکان ، گەرماوەکان ، دەڕۆشتن ، بە پاکی خۆیان دەشوشت و جلی پاك لەبەر دەکراو پێش دەست بە کفت و کۆ کردن ، هەریەکە سێ کەوچك هەنگوینی دەخواردو هەڵوای شیرینییان دەبەخشیەوەو گەردن ئازادییان لە یەکتری دەکرد ، ئەمەش ماوەی (٥) رۆژی دەخایاند ، سەری رۆژی شەشەمی ( شاه ) لە بارەگا دادەنیشت و خەڵکی دەچوون بۆ لای و باج و خەرجییان بۆ دەبردو ئەویش خەڵکی بەندی ئازاد دەکردو لێخۆش بوونی ( شاه ) بۆ گوناهباران دەردەچوو و دەست بە ئاهەنگ گێران دەکرا شایەنی باسیشە ئەم ڕۆژانە بە شێوەی میهرەجان دەبرانە سەر .

جەژنی ( ئاگر )یش کە رێککەوتی (١٠) دەی مانگی ( بەهمەن )ی دەکردو ئەم مانگەیش شوێنی مانگی ( ئەهرۆمزدە ) کەوتووە ( زۆر سەرچاوە باسی ئەمەی کردووە ( بیرونی ، هەرتسفێلد ، کریستنسن )، ڕەگ و ڕیشەی دەبڕێتەوە سەر سەروکلاوی شاه ( هۆشەنگ )ی پێشدادی .

هەندێکی دیکەیش دەیبەنەوە سەر ( بیوراسب = زوحاك )ی زوڵم و جەوردار .

( بیرونی ) بیری بۆ ئەوە دەچێت . کە لەم جەژنەدا ، ( بخورر ) بسووتێنرێ بۆ ئەوەی خراپی دەربکەن . بەم جۆرە تا ئەم جۆرە یادکردنەوە بوو بە رەسم و باوو بڕەوی دینی بۆ لێپاڕانەوە یاخود پاککردنەوە .

ئەوەی کە من بۆی بچم ، ئەوەیە .

١ ـ جەژنی بەهار لە سەرەتای یەکەمی رۆژی بەهاردا بووە ، هەر ناوچەیەکیش بە پێی ئەو رۆژەی کە پێی ناوەتە بەهارو ئەمەش بووەتە هۆی جیاوازی لە نێوان بەهاری کوێستان و بەهاری گەرمەسێردا . ئەگەرچی گەلەکان گەلی ئێرانی بن و یەك روو . و ڕەوشتیان هەبێ .

٢ ـ جەژنی ( ئاگر ) لە نێو سەرانسەری گەلە ئێرانییەکاندا ، ئەگەر لە پێش زەردەشتدا نەبووبێ لە سەروکلاوی ئەودا نەریتێکی دینیی بووە ، بۆ مەبەستی یادکردنەوەی خواو لێپاڕانەوەی بۆ لە گوناه خۆشبوون .

٣ ـ ئەم جەژنانە یەکیان نەگرتووە . تاکوو سەرەتای یەکگرتنی دین و دنیاو یەکبوونی تەقویمی دینی و سیاسی و کردنی تەقویمی سیاسی کە (٣٥٥ـ٣٦٦ ) رۆژە بە تەقویمی رەسمی و دینی . بە لای منەوە ئەم مێژوویەش بۆ سەردەمی سەروکلاوی ئەردەشێری بابکان و سەردەمی تەنسەر دەگەڕێتەوەو نامەکەی تەنسەر کە بە شێوەیەکی ئاشکرا تیایەتی کە شاه جگە لەوەی ( شاه )یشە ، هەروەها یەکێکە لە پیاوە دینییە هەرە گەورەکان و بڕیاری یەکبوونی دین و دنیای داوەو دینیش پاڵپشتیەتی .

بۆیە ، جەژنی میهرەجان گێڕاوەو لە نێوارەشیەوە ئاگر لە دەرەوە بۆ مەبەستی دوعاکردن و خراپەدەرکردن و بەرپاکردنی خۆشی و بۆ مەبەستی شێوە میهرەجان وەرگرتن لە قالبێکی تەسكدا چووەتە دەرەوە .

## سەرچاوەکان

١ ـ ( کتاب تنسر ) اقدم نص عن النظم الفارسية قبل الاسلام . نقله الى العربية ( يحيى الخشاب ) عميد كلية الاداب – جامعة القاهرة ، ١٩٥٤ )

ئەم کتێبە بە کورتی وەلامی ( تەنسەر )ە . کە یەکێك بووە لە پیاوە دینییە گەورەکانی زۆر نزیك بە (ئەردەشێر)، وەك وەلامێکۆنەیێ بۆ یەکێ لە شاه وەچەکان ( ملوك الطوائف ) کە رەخنەی لە سیاسەتی ئەردەشێر گرتبوو . تەنسەر توانیی بە هۆی ئەم نامەیەوە یارمەتیەکی زۆری ئەردەشێر بدا ، بۆ دامرکاندنەوەی ئاژاوەو یەکگرتنی وڵاتی ئێران ( ٢١٢ – ٢٤١ ) زایینی .

٢ ـ نشريه انجمن فرهنگ ايران باستان . سالى چهارم شماره (٢) اسفند ماه ( ١٣٤٥ ) پێشدادیان و کیانیان . د . ابراهيم پورداو (١) .

جستجوى حقايق تاريخى . دكتور ذبيح الله صفا (١٣) .

زرتشت و دربار ويشتاسب شاه . دكتر بهرام

رەوشی (٢٢) .

داستانهای مشترك ایران و هند در روزگـــار باستان . علی اكبر جعفری (٣٤) در یادداشت . علی اكبر جعفری (٥٠) .

٣ ـ كتاب ( الفنديداد ) أهم الكتب التي تتالـف منها الابستا . نقله من الفرنسية وعلق عليه الدكتور داود الجلبي الموصلي ـ طبع بمطبعة الاتحاد الجديـــد بالموصل عام ١٩٥٢ م .

٤ ـ تراث فارس ، كتب فصوله اساتذة مـــن المستشرقين ، اشترك في كتابته واشرف على نشره ا. ج. اربری . نقله الى العربية اساتذة كليه الاداب ـ جامعة القاهرة . محمد كفاحی . السيد يعقوب بكر ، احمـد الساداتي ، محمد صقر خفاجه ، احمد عيسى . اشترك في كتابته وراجع ترجمته يحيى الخشاب ـ ١٩٥٩ .

٥ ـ ايران في عهد الساسانيين . تاليـــف كريستنسن استاذ الدراسات الايرانية في جامعـــة كوبنهاكن . ترجمه الى العربية يحيى الخشاب اســـتاذ الدراسات الشرقية ـ جامعة القاهرة .

راجعه ، عبدالوهاب عزام استاذ الدراســـات الشرقية ـ جامعة القاهرة .

٦ ـ هاوكاری ، ژمارەی تایبەتی بە بۆنـــــەی نەورۆزو ئازارەوە ، ١٣ـ٣ـ١٩٧٨ وشـەیەك دەربارەی نەورۆز . نووسینی نووسەری ئەم باسە .

٧ ـ بەیان ، ژمارە (٢٣)ی سالی (١٩٧٥)ز .

٨ ـ پاشكۆی عیراقی كوردی ، ژ . (١٢)و (١٣)ی شوبات ئاداری ( ١٩٧٨ ) .

٩ ـ رۆشنبیری نوێ ژ (١٣)ی ٢١ـ٣ـ١٩٧٤ .

١٠ ـ ژین ، ژ ( ١٣٨٦ ) .

١١ ـ ژین ژ ( ١٣٣٧ ) ٢١ـ٣ـ١٩٥٧ .

١٢ ـ مروج الذهب ومعادن الجوهر ـ للمسعودی ١ـ٢ ـ دار الاندلس .

١٣ ـ دیوانی مەولـەوی ـ كۆكردنــــــەوەو لێكۆلینەوەو لێكدانەوەو ، لەسەر نووسینی ( مـــەلا عبدالكريمی مدرس ) چاپخانەی ( نەجاح ) بەغـدا ـ ١٩٦١ .

١٤ ـ دیوانی صەیدی ـ كۆكردنــــــەوەو شی‌كردنەوەی ( محمد امین كاردوخی . چاپخانـــەی كامەرانی سلیمانی ـ ( ١٩٧١ )ی زایینی

١٥ ـ المنجد في اللغة والادب والعلوم .

١٦ـ آوستا، نامه مینوی آیین زرتشت .نگارش جلیل دوستخواه ، از گزارش استاد ابراهیم پورداود .

١٧ ـ الفردوسي ، الشاهنامه ـ ملحمة الفرس الكبری ـ لابی القاسم الفردوسی ترجمة سمير مالطي ـ دار العلم للملايين ـ بیروت ١٩٧٧ .

١٨ ـ كتاب تاريخ مردوخ ، ج١ .

(١) تەماشای ( پیرەمێردی نەمر ) بكە نووسینی محەمەد رەسوول هاوار ـ بەغدا (١٩٧٠) (٧ـ١٧) .

(٢) ژین . ژمارە ـ (١٣٣٧) .

(٣) ژین . ژمارە ـ (١٣٨٦) .

(٤) ژین ، ژ ـ (١٣٣٨) نەورۆز ـ نەجمەدین مەلا

(٥) ژین ژمارە (١٠٥) ســــالی ١٩٧٣ نەورۆز د. محەمەد نووری عارف .

(٦) پاشكۆی عیراقی كـــوردی ـ ژ ( ١٢ـ١٣ ) ١٩٧٨ عەبدول رەحمان مزووری .

(٧) وەك : كاكەی فەللاح . ( دكتۆر ئیحسان )، جگەر خوێن . هەردی .. هتد .

(٨) تەماشای پاشكۆی عیراق بكە (ژـ١٢/١٣) ، ١٩٧٨ ـ نـــەورۆزو هۆزانڤانێت كـــرمانجی ژووری عەبدولڕەحمان مزووری .

(٩) هەمان سەرچاوە .

(١٠) تەماشای دیوانی صەیدی هەورامی بكە . كۆكردنەوەی كاردۆخی (١٨٣ ، ١٨٤ ، ١٨٥) .

(١١) تـەماشــــای دیوانی مەولـــەوی بكـــە ، كۆكردنەوەی كاردۆخی ( ل ١٨٣،١٨٤،١٨٥ ) .

(١٢) تەماشای پیرەمێردی نەمر بكە ، نووسینی محەمەد رەسوول هاوار (ل ١١٩)

(١٣) تەماشای ( بـەیان ) ی ژ . ٢٣ ی سالی ١٩٧٥ بكە .

(١٤) تەماشای بەیان ژ (٢٣) ی ١٩٧٥ (ل ـ ٢) بكـە .

(١٥) هەمان سەرچاوە .

(١٦) تەماشای پاشكۆی عیراقی كـــوردی . ژ (١٢ـ١٣) ی سالی ١٩٧٨ (ل ٢٣) بكە .

(١٧) تەماشـــای رۆشنبیری نوێ ، ژ (١٣) ی سالی ١٩٧٤ بكە .

(١٨) تەماشای « مروج الذهب ومعادن الجوهر ـ المسعودی » (ل ٢٤٧) بكە .

(١٩) تەماشای (ل ـ ١٥٠ ـ ١٦٤ ) . ايران في عهـــد الساسانيين . ارثر كريستنسن ترجمة يحيى الخشاب . مراجعة عبدالوهاب عزام ، ١٩٧٥ .

(٢٠) مێژووی مەردوخ ل ٤٦ . ج١ .

(٢١) تەماشای كتێبی ئاوێستا. جوزمی الفنديدا.

ل١٢ بکه ٠ نقله من الفرنسية وعلق عليه . الدكتور داؤد الجلبي الموصلي (١٩٥٢)م ٠

(٢٢) تەماشای کتێبی ( تاریخ مردوخ ) ج١ ل٤٤ـ٤٥ بکه ٠

(٢٣) تەماشای (ل ٧٣) ی کتێبی : ایران فی عهد الساسانین ، بکه . تالیف آرثر کریستنسن ٠ ترجمة یحیى الخشاب . مراجعة عبدالوهاب عزام ٠

(٢٤) تەماشای (ل ١٣٥) ی کتێبی ( أیران في عهد الساسانیین . تألیف ارثر - کریستنسن ٠ ترجمة یحیى الخشاب ، مراجعة عبدالوهاب عزام ٠ بکه ٠

(٢٥) ـ هەمان سەرچاوە ، ( ل ١٣٤ ) ٠

( ٢٦ ) تەماشای کتێبی تەنسەر دواێنی لاپەرە (٤٥) بکه ٠

ئەم کتێبە ئەو نامەیەیە کە تەنسەر ، گەورەترین پیاوی دینی سەرو کلاوی ئەردەشیر ( ٢١٢ ـ ٢٤١ ) ، بە مەبەستی یاریدەدانی ئەردەشیر بۆ یەکگرتنی گەلەکانی ئێران ، بە ناوی بوونە یەکی ( دین و دنیا ) نووسیویەتی بۆ یەکێ لە وەچە شاکانی ( تەبەرستان ) . بۆ ئەوەی بێنە سەر رێی راست ٠

ئەمەش ناونیشانیەتی : ( کتاب تنسر ) اقدم نص عن النظم الفارسیة قبل الاسلام ، نقله الی اللغة العربیة یحیى الخشاب . عمید کلیة الآداب ، جامعة القاهرة لسنة ١٩٥٤ ٠

(٢٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ل ٤٥ ) ٠

(٢٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ل ٤٥ ) ٠

(٢٩) تەماشای کتێبی ( معادن الجوهر ومروج الذهب ) للمسعودی ( ل ٢٤٣ - ٢٤٧ ) بکه ٠

(٣٠) تەماشای کتێبی ( تراث فارس ) أ ٠ ج آربری ؛ ترجمة نخبة من اساتذة جامعة القاهرة ـ کلیة الآداب ـ راجعه یحیى الخشاب ( ل ٧ ) بکه ٠

(٣١) تەماشای هەمان سەرچاوە . هەمان لاپەرە بکه ٠

(٣٢) تەماشای کتێبی ( الفندیداد ، ترجمة من الفرنسیة الی اللغة العربیة الدکتور داود الحلبي الموصلي ( ص ـ ٤٠ ) ، بکه ٠

(٣٣) تەماشای هەمان سەرچاوە . بەشی (٢١) هەمی ٠ ( ل ٨١٩ ) بکه ٠

(*) تەماشای ( نشریه انجمن فرهنگ ) ایران باستان ، پیشدادیان و کیانیان . ابراهیم پوردواود ( ل ١١ . ١٢ ) بکه ٠

(٣٤) ـ تەماشای کتێبی ( الفردوسی . الشاهنامة، ملحمة الفرس الکبری . ل ١٥ ـ ١٦ ) بکه ٠

(٣٥) ـ تەماشای کتێبی . الشاهنامة . ملحمة الفرس الکبری . ( ل ١٦ ) بکه ٠

(٣٦) تەماشای کتێبی ( ایران في عهد الساسانیین ) ٠ تألیف آ ٠ ج آربری ، ترجمة ، یحیى الخشاب ، ومراجعة عبدالوهاب عزام ( ل ٢٠٢ . ٤٨٣ ) بکه

( ٣٧ ) تەماشای : نشریه انجمن فرهنك ایران باستان ٠ ( وتاری - پێشدادیان و کیانیان - نووسینی د ٠ ابراهیم پیر داود ٠ بکه ٠

(٣٨) تەماشای . المسعودی . ( مروج الذهب ومعادن الجوهر ) ( ل ٢٤٧ ) بکه ٠

( ٣٩ ) تەماشای نشریه انجمن فرهنگ ایران باستان ، ووتاری . پێشدادیان و کیانیان ٠ د ٠ ابراهیم پیر داود ، ( ل ١١ ، ز١ ) بکه ٠

(٤٠) المسعودی ٠ ( مروج الذهب ومعادن الجوهر) ( ل ٢٤٧ ) القسم الاول ٠

(٤١) ـ تەماشای

English Literature: John Bulgess Wilson,... The begining of Drama, p. 64, 65, 66.

بکە

(٤٢) ـ تەماشای کتێبی ( الفردوسی . الشاهنامة) ملحمة الفرس الکبری ) ص ( ١٨ ، ١٩ ) بکه ٠

(٤٣) ـ تەماشای کتێبی ، تاریخ مردوخ ج ١ ل ٤٦ بکە ٠

(٤٤) ـ تەماشای کتێبی ( ایران فی عهد الساسانیین ، بکه ، تألیف ا . ج اربری ، ترجمة یحیى الخشاب ومراجعة عبدالوهاب عزام ( ل ٢٥٩ ) ٠ بکە ٠

(٤٥) هەمان سەرچاو هەمان لاپەرە ٠

## پاشماوەی ل ٢٥

١٤ ـ سەیری کتێبی گەشتی مارکوپول ـ بکە ٠

MARCO POLO VENETIANO, Delle Merauiglie del Mondo per lui Vedute - Dinuovo ristampato etc. Trevigi 164⁰

١٥ ـ سەیری Philostorgius وهەروەها بطلیموس وسطیفانی بزنطی وامیانوس مارکلینوس ٠

١٦ ـ کاتێ کە ریچ لەگەل عوسمان پاشای بابەندا ئەدوێ . لە سلێمانی لەسەدەی نۆزدەدا ، ئەم زاراوانەمان ئەخاتەوە یاد ، کە باسی پاشا ئەکات و ئەلێت والی سنە لە خێزانی گۆران دائەنرێ ٠ کە ئەم خێزانە کۆچەر نین ...

ئینجا پاشا دەست ئەکات بە دوانی لە بنچینەو رەگەزی خێزانەکەی و پەیوەندی ئەم خێزانەی بەخێزانی والیەوە ئەلێت : خێزانی والی سنە کۆنە ، و گۆران خێل نییە ، ئەم دوو خێزانە خانەدانن : وە سلێمان پاشا ئەگەڕێتەوە بۆ خێزانێک کە ناوی کرمانجە Kermanj بەلام هەرچی ( بەبە )یە ناوێکی تایبەتییە بۆ خێزانێک کە لەپێشتر داژیاون ٠

٠ .... ئینجا سلێمان پاشا ڕۆیشتووە بۆ ئەستەنبول پێش ١٢٥ سال واتە لە ١٦٧٨ ی زاییندا ٠

وەتورکەکانی پەوێی هان داوە لە دژی فارسەکان و ئینجا ناوی پەیدا کردووە و ناسراوە بە نازناوی ( بەبە )یان ( بابان ) دراوە بەخێزانەکەی لەجێی ناوەکەی خۆی کە کرمانج بووە ٠

سەیری :

Rirch Residence in Koordistan 1836 I

London Republished in 1972 - P. 80, 81

چاپی ١٩٧٢ ـ بکە ٠

١٧ ـ بگەڕێرەوە بۆ وتارەکەی مامۆستا توفیق وەهبی لە ژێرناوی ( کرمانج )دا ، لەگۆڤاری پرشنگ ٠ ژمارە (٤) نوفمبر ١٩٧٢ ـ ل ٣٧ .

## تێبینیەك

باسەکەی د ٠ کوردستانی موکریانی ـ ( دەنگی ئافرەتی کورد لە هۆنراوەکانیدا ) ـ کە لە مهرەجانی ڕوشنبیری لە هەولێر خوێندرایەوە لە گۆڤاری (( بەیان )) ژمارە ٦٣ی سالی ١٩٨٠ بە تەواوی بلاوکراوەتەوە ...



# رۆلی فۆلكلۆری كوردی له دیاری

سەرنج‌دان لە ئەدەبی فۆلکلۆری ئەو ڕاستی‌یەمان بۆ ئاشکرادەبێ فۆلکلۆریی هەر نەتەوەیەك ڕەنگدانەوەی واقعی ئەلەکەیەتی . کەشانەوەیان ، پێشکەوتنیان‌و یەککرتنیانە دواکەوتوویی‌و لاوازی‌وبێ‌هێزی‌یان ... ئەدەبی هەموو نەتەوەیەك پێك دەهێنێ .

یەکێک لە میللەتانی ڕۆژهەڵات‌و ئاسیای ناوەڕاستدا کە کەلەپورێکی گەورەو بەهاداریان لە فولکلۆردا هەیە گەلی کوردە .

لە فۆلکلۆری کوردی‌دا گۆرانی بە دەولەمەندترین بەشی دەژمێردرێ ... زۆر لە گەشتکەرە ئەوروپی‌یەکان لە سەدەکانی ڕابووردا سەریان لە کوردستان داوە‌و ئەو ماوە زۆرەی کە ماونەتەوە لەرێکەی ئەدەبە سەرزارییەکەوە فێری زمانی کوردی بوون .. کاتێ کە گەڕوانەتەوە چەندەها تێکستی جۆراوجۆریان لە گۆرانی‌و بەشە کانی دیکەی فۆلکلۆرا لەگەل خۆیاندا بردۆتەوە وڵاتەکانیان لە چاپیان‌داوە .

یەکێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانەی کە بە شانازی‌یەوە ستایشی فۆلکلوری کوردی‌یان کردووە ڕووناکبیری ئەرمەن « خەچاتور ئابوڤیان »ە کە دەلێ :

« لەهەر کوردێکدا هەستو بەهرەی شاعیری بەدی‌دەکرێت‌و زۆر بەسازو ئاواز گۆرانی بەسەر چیاو دۆڵ‌و ڕوبارو تاڤگەو گوڵ‌و چەکو ئەسپو قارەمانیەتی‌و جوانیاندا دەلێن »(١) .

یەکێك لەو هۆیانەی کە یارمەتی دەولەمەندی کەلەپوری داوە هەلکەوتی باری گیۆگرافی‌یە . کە کوردستان ولاتێکی شاخاوی‌یەو سروشتێکی جوانی دل‌ڕفێن‌و ڕازاوەی ڕەنگاورەنگ‌و کانیاوو ڕووبارو سەوزایی هەیەو لە هەمان کاتدا زۆربەی هەرە زۆری کورد نەخوێندەواربون کە ئەم سامانە بەهاپەیان لە سینگیاندا پاراستووە .

هەروەکو لە مێژووی فۆلکلۆردا دەرکەوتووە ، گۆرانی بەیوەندیەکی تەواوی بە باری ژیانی کۆمەلاتی‌یەوە هەیەو . گەورەترین هۆی کاریگەرە لە پێش‌خستن‌و ژیاندنەوەی کەلەپوردا .

لێکۆلینەوەو وردبوونەوە لە ژیانی ئەتەوە کەمانەوە دەمان‌گەیێنێتە ئەوەی کە کورد هەر لە کۆنەوە پابەندی گۆرانی‌و ئاوازی گۆرانی‌بووە ... ئەوەندەی گەلی کورد حەزی لە گۆرانی‌یە ، حەزی لە هەر شتێکی دیکەی فۆلکۆر بوایە گەنجینەی فۆلکلۆر زیاتر دەولەمەند دەبوو .

لە ئوردەواری دانیشتوانی گوندو شارەکان زۆربەی شەوانیان بە ئاوازی خۆش کالیان بردۆتە سەر ... چوار وەرزی ساڵ دیوەخانی گەورە پیاوانی دێ‌و شار لە پیاوان‌و گۆرانی بێژان جمەی هاتووە .. لە زستاندا لە مزگەوت‌و حوجرەی فەقێیانیشدا شەوگاری درێژیان بە گۆرانی‌و حیکایەت‌و یاری فۆلکلۆری بردۆتە سەر .. ئەو گۆرانیانەی کە بەناو گەلا بلاوبۆتەوە ئەگەر کێومالێك بکرێن بۆ کۆکردنەوەو لێکولینەوەیان بە جوانی باری کۆمەلایەتی . مێژوویی ، سیاسی دەردەکەوێ .

جالێکولینەوە لە ژانرەکانی فۆلکلۆری کوردی کاری‌گەری مێژوویی‌یە .. ئەگەر لە مێژووی ڕابوردومان بکەین . ئەو کاتە زۆرباش بەرهەمی ئێستامان تێدەگەین . گرنگی‌و بایەخ‌داری فۆلکلۆر لە هەست‌و ئەستی بەرهەم‌هێنەراندا . خۆشی‌و خۆشەویستی‌و تام‌و چێژی گەل . جەنگاوەران . کارەساتی گەورەی مێژوویی لە وولات . چەوساندنەوەی چینایەتی . پەلاماردانی بێگانە بۆ سەر وولات‌و ڕۆلی قارەمانەکان‌و ڕۆلەکانی گەل لەبەگژاچوونی ئەو داگیرکەرانەدا لە گۆرانی‌و لاوك‌و بەند‌و حیکایەتدا تێدەگەین . مێژووی نەتەوەی کورد وەك زنجیرەیەکی نەپچراو بە مێژووەوە پەیوەستە .. هەر ڕووداوێکی کۆمەلایەتی بەرچاو ، هەر چیرۆکێکی

# …ردی ڕووداوی مێژوویی دا



شکریە ڕسول

…ێ شیرینی دڵداری و هەرشایی و شینێکی گەورە …ەر مەڵبەندێکی کوردستانەوە قەوماوێ ، خۆش‌ئێژد …وخوانە کوردە نەناسراو و نەخوێندەوارەکان …ەرکێشی برگەیی خۆمانە بەزمانێکی ساکار و …حتو پاراو و ڕەسەن و ڕەوان هۆندویانەتەوەو …ەنگێکی تایبەتی خۆشیان بۆ داناوەو پێیان گوتووە …ەبێ ! (٢) .

هەروەك لە مێژووی کوردا ئاشکرایە . …ەروستبوونی دەرەبەگ و شێواندنی باری ئابووری و …ۆمەڵایەتی لە لایەن دەوڵەتی عوسمانی و فارسەوە …ووشی گەلی کورد بووە . کورد لە ژێر باری ناڵەبار و …ڕانی ئەوانا ناڵاندویەو گیرۆدەی چەوساندنەوەو …جەرمەسەری بووە . لە لایەکی تریشەوە چاوتێبڕینی …ێژ ئاواو دروستبوونی دوو زمانی لە نێوان عەشیرەتە کوردەکان و دەرکەوتنی جولانەوەی ئازادی‌خوازی …ەتەوەیی و بەرپا بوونی گەلێ ڕاپەڕین و بزوتنەوەو …ۆرش ... مێژوویەکی دێرینیان بۆ نەتەوەکەمان …ەخشاندوە . کە ئەمەش سامانێ کەلەپوری …ەتەوایەتیمانی دەوڵەمەندکردووە .

بەڵێ هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان و بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلام گەلێ چیرۆك و گۆرانی و پەندی داستانی …ری کوردیی دروست کردووە .. جا هەروەك لەناو …ەدەبە سەرزارییەکەو مێژوودا دەرکەوتووە ... کوردەکان پێش ئیسلام بوونیان لەسەر دینی زەردەشتی بوون . ئەو دینەش …ی بە دوو هێز …ەبووە ... هێزی چاکە لە وێنەی ( ئاهورامەزدا )و هێزی خراپە لە وێنەی ( ئەهریمەن ) . هەر بۆیە پەندێکی کوردی هەیە کە نیشانەی خراپەو ناپەسەندی و ناشیرینی دەردەخات و دەڵێ :

**بەدخوو دۆستی ئەهریمەنە .**

هەروەك وتمان ( ئەهریمەن ) نیشانەی هێزی خراپەیەو هەمیشە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ بۆ کردارو …ڕەوشتی خراپ ... مرۆڤی بەدخوو دەکا بە هاوڕێی خۆی ... لەرێکەی ئەم پەندەوە وەلا پەندێکی مێژوویی دەگەینە ئەوەی کە ئەهریمەن نیشانەی هێزی خراپەیە لە ئاینی زەردەشتا ... پاشان مێژوو ئەوەی سەلماندوە کە کوردەکان وردە وردە ئاینی ئیسلامیان بە شانازی‌یەوە وەرگرت و بوون بە موسڵمان و قسەی زۆر و زۆرووتنیان بەلاوە ناپەسندەبووە . تەنها قورئان نەبێ ... هەربۆیە لە ئەنجامی تاقی‌کردنەوەی ڕۆژانەدا ئەو پەندە دەرکەوت دەڵێ :

**زۆر ووتن هەر قورئان خۆشە**

لە فۆلکلۆری کوردی‌دا بە تایبەتی لە شێوەی هەورامی‌دا ئەو گۆرانی‌یە بە دی‌دەکرێ کە کاتی خۆی ئاگرپەرستەکان دەست بەرداری ئاین و نەریتی خۆیان نەبوون و ملیان نەداوە بۆ موسڵمان بوون لەبەر جەورو

ستەمی کاربەدەستانو نەریتی کۆمەلایەتیدا توانای ئاو ئاوەدانیان نەماوە . بەنایان بردووەتە شاخە بەرزەکانو لە بارێکی وا نارەحەتدا ژیاون . بوون بە نموونە بۆ خەلكو هەر کەس دووعای شەڕی لە یەکێك کردبێ پێی وتووە خوا ئەوەت بەسەر بێنێ کە بەسەر گەوری سەرکێوەکاندا هاتووە . بەیتەکەش ئەمەیە :

**ئەگەر گیان کێشان چوون دووری تۆ بۆ**

**یاخوا بەنسیب گەوری سەر کۆ بۆ (٣) .**

دیارە دیاری کردنی ئەم بەیتە باری ژیانی بەشێکی گەلەکەمانی تۆمار کردووە کە کەوتوونەتە بەر چەوساندنەوەی ئایینیو لە ئازادی بیروباوەری ئەو سەردەمەدا بێ بەش کراون ئەگەر ئەم بەیتە نەبووایە لەم ڕووەوە لەوە زیاترمان نەدەزانی کە دیارە لە کۆمەلێکی دواکەوتوی وەك کۆمەلی هەزارسال لەمەوبەرو پێشتر ئەو ماوەیەدا لە کوردستانا کەس ئازادی‌یەکی ڕاستەقینەی نەبووە .. ئاینێکی جیا لە ئاینی زۆربەی خەلكو چینی حوکمرانی هەبێ . ئەگەر ئەم بەیتە نیشانەی ئەو جەورو ستەمە نەبێ کە بەسەر ئاگرپەرستانی ئەو سەردەمەدا هێنراوە . ئەبێ ئاگرپەرستەکان لەبەرچی مەڕو مالو باخو زەویو زارو دێو کانیاوی خۆیان بەجێهێشتبێو پەنایان بردبێتە ناو ئەشکەوتەکانو لووتکەی شاخێکی ڕەقو تەقو ساردوسڕیان بۆ خۆیان کردبێ بەماواو هەر لەم بەیتەی خوارەوە نیشانەی ناخۆشی ژیانی ئاگرپەرستە هەلاتووەکان دیارە کە دەلێ (٤) :

**هەناسەی سەردم سەنگ مەتاو نۆ**

**گەوری سەر کێوان من مەلاو نۆ**

ئەو داستانو سەرگوزشتانەی کە مێژووی شەڕو شۆڕیان تۆمارکردووە بە « بەیتی مەجلیس » ناسراون کوردەکانی ژووروی ڕۆژئاوا دەلێن « سترانێ میرانی » یا « سترانێ یارا ، سترانێ شەڕا » ، کوردەکانی باکوور دەلێن «سترانێ نوسارا» یا خود « لاوك »(٥) .

گۆرانی میرانی یا خود سترانێ میرانی تەنها لە کاتی کۆچ کردنو بارکردنا ناوترێ بەلکو دەنگبێژ یاخۆ گۆرانی بێژ کاتی ئێواران بە جەماعەت لە دەوری گۆرانی بێژ کۆدەبنەوە . ئەو کاتە « ستران » یان دەربارەی شەڕو پالەوانو گەورەی ڕابووردو دەگێڕایەوە ... هەر وەك ئاشکرایە گۆرانی‌بێژ بە دوو جۆرە ئەم لاوکانە یاخود گۆرانی میرانەیان ئەووت لە شێوەی پەخشانو دواییش دەیانکرد بە گۆرانی..

یان بە شێوەی گۆرانی‌ و دوایی بەسەرهاتەکەیان وردە وردە دەگێڕایەوە ... جا زۆربەی کات کە گۆرانی‌بێژ لە دیوەخانێکدا سترانێ میرانی دەووت .. لە پێشیشا بەسەرهاتەکەی دەگێڕایەوەو پاشان وردە وردە هەموو کارەساتەکەی بە گۆرانی دەیووتەوە . کە بەهیچای هەشت برگەیی یاخود بیست برگەیی خۆمالین ... لە کۆنا هەر ئاغایەك یاخود بەگێك یەك یا دوو دەنگبێژی هەبوون کە سترانێ مێرییانە ـ گۆرانی پالەوانانەیان دەووت، لەگەل خۆیاندا دەیانسوڕاندنو لەگەلیانا دەچوونە شەڕو ئێوارانیش لە دیوەخان بە ئیزنی میر دەستیان دەکرد بە گۆرانی ... گۆرانی مێژوویی کە گۆرانی بێژ هەر خۆی مێژوونووس بووەو مێژووی بەسەرهاتی دەگێڕایەوە(٦) .

لەناو گۆرانی فۆلکلۆریدا وێنەی شەڕەکانی نێوان سولتانی عوسمانیو کوردەکانو میرەکانی بەبە . حوکومەتی شێخ مەحمودو ئینگلیزەکان ... سمایل خانی سمکۆو حوکومەتی شێخ مەحمودو شای ئێران.. شەری شێخ سەعیدو حوکومەتی کەمالیستەکان هەروەها زۆرداری ڕەزا قولی خانو ئەحمەد خانو ڕەشید پاشای عوسمانی ... مێژووی ئاغاو میرو عەشیرەتە کوردەکان لە ئەدەبە سەرزاییەکەدا دەردەکەوێ . لەم ڕووەوە دەبینین مێژووی گەلی کورد لە بنچینەدا مێژووی خەباتی چەوسانەوەی نەتەوەیی‌یە کە چەند سەدە لە دژی چەوسێنەرە بێگانەکاندا خەباتی کردوە .

لەگەل ئەم هەموو جەنگو ستەمکاری‌یە ناڕەوایی‌یەی کە بەسەر گەلی کوردیان هێناوە ، کورد مەردانە بە تاقی‌کردنەوەی ئەم هەموو جەنگە ستەمکاری‌یانەدا تێپەڕیووەو ئازایانە ئەدەبو زمانی خۆی پاراستووە(٧) .

بەلێ هەروەك د . نوردیخانی جەلیل دەربارەی گۆرانی مێژوویی‌و ڕووداوی مێژووی کوردەکانی تورکیا دەبێژێ :ـ

لەناو ڕمزو ڕەز بەبێ باوك کەس کوردەکان مەنهاتنو ڕوویان کردە رووسیاو ئەرمینیا . گەلەك هاتنەکوشتن ، گەلێکیش مردن ، گەلێ گۆرانی لەناوچووەو چۆتە ژێرگل ، ئەو گۆرانی‌یە مێژوویی‌یانەی کە ماونو بە ئێمە گەیشتوون . سترانی تاریخی شێخ میرزو . بێ مجوێ شێخ عیسایە(٨) .

هەروەك مێژوو باسی دەکا لە ڕووی کۆمەلایەتی‌وە، حوکمەتو ئەرمـ ـوایی تورکەکان لە ڕووی ورووژاندنی

نینەوە کەوتبوونە هانـــدانی هۆزە کـــوردەکان دژی ئەرمەنییەکان . لە تورکیـــا لە ژێر سایەی دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا چەوساندنەوەو ئازاردانی ئەرمەنیەکان ـــە برەودابوو ، فـــەرمانڕەوا تورکـــەکانیش بۆ چەوساندنـــەوەی ئەرمەنیـــەکان ئاغاڵ دەرە بـــەگەو وەر ی کوردیان هاندەدا ، ئازاردان و چەوساندنەوەی ئەرمە ـــەکانیش لەســـەردەمی ســـولتان عەبـــدول حەمیـــدابوو . فەرمانڕەوا تورکـــەکان بـــە هەستی کۆیرانەی ئایینی سیاسەتی ستەمکاری ڕۆژانەی خۆیان هەڵدەسووراند ... دڵی کاربەدەســـتان هەر بـــە کوشتن و برینی ئەرمەنیەکان ئارامی نەگرت ، بەڵکـو فەرمانڕەوا تورکەکان بێبەزەییانە کـــەوتنە ڕێزەی کوردەکانیش و گەلێکی زۆریان لێ کوشتن . بە تایبەتی لە کوردە یەزیدیەکان . کە لەڕووی ئاینەوە لەگـــەڵ تورکەکاندا جیوازبوون . ئەوانیش وەك ئەرمەنیەکان دەچەوسانەوە چونکە ســـەریان بۆ سولتانی عوسمانی شۆڕنەکـــردبوو ... هـــەر بۆیە کـوشتاری شێخ میرزاکراوە چونکە یەزیدی بووەو نەیویستووە بەقسەی پاشای تورك بکا .. ئەمین پاشا لەگەڵ ڕەشید پاشـا تورك بوون . بانگی شێخ میرزایان کردووە بچنـــە شەڕی دیاربەکر دژی ئەرمەنیەکان و پێیان ووتووە ... « تۆ شێخی ئێزدی سەرۆکایـــەتی لە دەستی تۆ دایە ، گەرەکە تۆ شتێك بکەی کە هەموو یەزیدیەکان ببنـــە موسلمان ، شێخ میرزاگوتی‌یە : ئێمە بۆ تۆ زەرەرمان نییە . هیچمان لە ئێوە نەکردوە ...

بۆچی وا بە زۆر دەتانەوێ . ئێمە بکەنە موسلمان : ووتیان : « ئەگەر تۆ موسلمان نەبی ئێمە تۆ دەکوژین و ئەو کاتە هەموو یەزیدیەکان تەواو دەبن » . بەم جۆرە شێخ میرزا لەگەڵیاندا کەوتە شەڕکردن و دوانزە کەسی لێ کوشتن . پاشان ئەوانیش شێخ میرزایان کوشت . گۆرانییە مێژوویی‌یەکەش بەم شێوەیە دەست پێ دەکا :ـ

ڕەشید پاشا گۆ :ـ

کەکێ مەلۆ . توڕانی دینێ محەممەد دینەکێ

ئەشکەلایە . وەرە سەرریا حەقیقێ »

شێخ میرزایێ بابێ مەلۆ گۆ :

ڕەشید پاشاوۆ ، م گۆ قەکا دینێ تەرمزیل کرۆ .

ڕەشید پاشا گۆ کاکێ مەلۆ

«[illegible]ڕا دفیم وەرە ئیسلام بە زۆرا شەرە»

شێخ میرزا کرەگازی گۆ :ـ

[illegible]گەلێ ئیزدیا ، چێبن . چێبخەتین ، فێحەوشـا دینێ[illegible] گری دوانزدە قەواز ب ئاقـەو ئیشان کوشتنە ، [illegible] مال[illegible]وستایێ خەنجەرا من نە ئاقایە ، قەوازێ سیزدا قەنەزا خەنجەرا من حەلیبیا .

**شێخ میرنا دەلێ :**

پشتا من بدەنە دارێ ، تفەنگ بدەنە دەستێ من بلا یەك بسەکنە ، پشتا من جفـارێ یکش ، دوژمن بلا ـبینن ئەز ساغم . بلا هێسیری ئیزدیە خەلاس‌بە(٩) .

لە فۆلکلۆری کوردیدا گەلێ داستانی دلـــداری هەیە کە ڕەنگدانەوەی مێژووی چۆنیەتیی ژیانی ئـــەو دەورەیە کـــە دەربەگایەتی لە کـــوردستاندا هەبووەو دەسەڵاتیان بەســـەر جینە بەشخوراوەکاندا بووە . هـــەمیشە لە وێنـــەی چەوساندنەوەدابووە ... بۆ نموونە : داستانی سیاچەمانە کـــە مەقامێکە لە ڕیزی گۆرانی حـــەیران و لاوك و هۆرەو مەقامـــەکانی تردا دەژمێردرێ . نموونەی گێڕانەوەی ئەو مێژووەیە کـە بە شێوەی هەورامی لەسەردەمی میرنشینی هەورامانەوە کـــە لە ســـەدەی یانزەدا بـــە دەستی سەفەوییەکان لەناوچووەو زۆربەی گـــەورەکانیان ڕوویان کـــردە شارەزوور بە تایبەتی لە ناوچەی ئـــەردەلاندا . خان ئەحمەدا خان یەکێك‌بوو لەوانەی کە خۆی ڕزگار کردو هاتە ناوچەی هەورامان و لـــەوێدا نیشتەجێ بوو و تا دەهات دەسەڵاتی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زۆرتر دەبوو ... دیوەخانی لە خـــەڵك و کاربەدەستان جمـــەی هاتووەو خاوەنی گۆرانی بێژی زۆریش بووە . وەك دەگێڕنەوە یەکێك لـــەو گۆرانی بێژانە ( یوسو ئاسکە ) بووە ( یوسو ئاسکە ) حەز لە ژنی ئەم ئەحمەد خانە دەکات کە ناوی ( کلاو زەر ) بوو ... ئافرەتێکی باڵا بەرزی چاوڕەش بووەو خۆشەویستی خان بووە ... کاتێ خان بەمە دەزانێ ( یوسو ئاسکە ) دەخاتە زیندان ... جا ئاگری خوشەویستی لە کونجی زینداندا زیاتر جۆش و گلپە دەستێنێ و بەگوڕتر و بەسۆزتر گۆرانی بۆ ئـــەم ئافرەتە دەڵێ ... هەروەك دەگێڕنەوە ئێشك‌گرەکانی زیندان بێ تاقەتی خۆیان بەم ئاوازە دلگیرانە دەرکردووە، لەگەڵ بەیاندا خان گوێی بۆ ئاوازو گۆرانیەکانی یوسو ئاسکە دەگرێ کە ووشـــەکانی بریتی بوون لە ژیانی تەنهایی و بێ بـــەزەیی و ژێردەستی و کۆیلەیـــەتی .. خان دڵی پێ دەسوتێ و بەرەڵای دەکات ... بەڵام کـــە ناوەڕۆکی گۆرانیەکە بۆ خان دەگێڕنەوە خان دووبارە فەرمان دەدا کە بیگرنە چوار دیوار لە قسل تامردن .. وە لە (زەڵم) لە ژوور ئەحمەد ئاواوە لە دیواری دەگرن لەگەڵ دانانی هـــەر بـــەردێك و تۆپـــەلە قسلێکدا هۆنراوەیەك دەڵێ بە ئاوازی سیا چەمانە کە هەمووی پاکانەکـــردن و دەرخستنی بێ گوناهی و بێ تاوانـــی و

جوانی‌بووه ٠

جا ئەم گۆرانی‌یه هەروەك دیاره له ناو جەرگەی گەلی ڕەنجدەرەوه هەلقولاوەو بەرهەمی ناو زینـــدانی شارێکی رژێمی دەرەبەگایەتی‌یه لەگەل زڕەی زنجیری ناو زینـــدانی تاریكو نوتەکا گونجاوەو خۆی بەرەو ڕووناکی کوتاوه(١٠) ٠

جا گۆرانیەکــەش بـەم شێوەیەیه که لەگـــەل ئاوەزەکەدا به جوانی دەردەکەوێ :

هەرچەندەکەرۆ خیالانی تۆ
ئەرمه شینمەن دووباره جەتۆ
ئاسەر زەمینه تۆ کەردەن بەبەر
تازیه بار ئای جەمن بەتەر
یاده جوابم یاوەش هەوالیو
با دەلەکەم پڕ بۆ جەگرد خیالیو
دەردیۆ من گرتەن باشقەی دەردانا
لقمانی حەکیم جێش سەر گەردانا
ئاوارەش ئاردەن ئویەرەکەی گول
تیره شانەش‌دا له تەنورەی دل
هەرچی له دەرگای گەردوون ئەنالام
خاستەر کالای غەم بریان وەبالام
بازه سەر بنیەو به مەمانتەوه
با گیانم دەرچێ بەر گیانتەوه
له گیان شیرین‌تەر من شك نەبەردەم
دام لەرێی خوانەزری تۆ کەردەم
کافر هەی کافر زالم هەی زالم
دەردەداری تۆم تاکەی بنالم ؟
ئامای‌و بەردی چاو به نیشاری
با ئالزەش گەرمی مەیڕ ڕو جارێ
ڕەنگ زەردی خەزان خەتای پایزەن
ڕەنگ زەردیه کۆ من دووری ئازیزەن
ئینه گرد خەتای کاری گەردوونەن
ئەننا من بێ تۆ قەرارم چونەن
زامداریو چون من دوختەریو چون تۆ
مشونا زامەکەی ساڕێژ مەبۆ ؟
ئەسالو ئەمانگ ئەحەوتەو ئەشەو
ئاساته وەشا پێوه گەرمێ خەو
جەوساوه سەودای تۆ کەوتەن ئەسەر
منیچ لێوەنا جه مەجنون بەتەر
گەرماکەی هامن سەرەش بەردانێ
چەمم کەوت به تو گەرم ئەمەنانێ
ئانا خەیلێومن دیەم لێت دوورەن
فرمێسکه چەمەی هانەی بلوورەن
ئەر ئینه ئەبۆ وه بۆنەی تۆوه
من چێش مکەرۆ پەی کەشو کۆوه(١١)

مێژووی گەلی کورد سەرەرای خەباتی نەتەوەیی ـ مێژووی خەباتی چینایەتی‌یشه به هەموو جۆرێکەوه که قوناغ له دوای قۆناغدا مێژوویەکی دروست کردوه .. جا له کۆمــەلێکی فـــره چینی کوردەواری‌دا کــه چەوساندنەوه هەمیشەو هەردەم له ئارادابووه ، لــه فۆلکلۆرا کێشەی ئەو چینانه رەنگی‌داوەتەوه به تایبەتی کێشەی چینه زەحمەت کێشەگان ، که هەموو مەسەلەو گۆڕانێکی بنەڕەتی له کۆمەلگا دروست‌کردووه.. جا ئەم کێشەیەی که بەدی دەکرێت به زۆری له داستانەکان ـ دارەنگی داوەتەوه ٠٠ کێشەی چەوساندنەوه به زۆری له داستانه دلداری‌یەکان‌دا دیاره که به جـــوانی لــه نێوان دوو لایەن‌دا هەژارو دەولەمەند ـ وەزیرو کچه وەرزێر ، کچه پاشاو کوڕه کەچەله ... ئەگەر ئەمانه به نیسبەت داستانی دلداری‌یەوه بێت ، که ئەو پەڕی نیشانەی کێشەی چینایەتی پێوه دیاره بەلام له داستانی قارەمانیەتی‌دا ئەو کێشەیه کەم به دی‌دەکرێ ، چونکه نیشانەی خەبات پیشان دەدات دژی ئــەو رژێمــه بێگانەیەی کــه دەیان چەوسێنێتەوەو هەولی گۆڕینی ئەو رژێمه دەدەن ٠٠٠

یەکێك له نموونەی ئەو داستانانه داستانی (قەلای دم ـ دم ) ٠ له سالی ( ١٦٠٧ ـ ١٦٠٨ ) ئەو قارەمانانەی بەشداری ئەو شەڕەیان‌کردووه دژی رژێم‌و دەسەلاتی شا عەباسی سەفەوی ٠ مێژووی ئەم داستانه ئــەوەیه پاش بەش‌کـــردنی کوردســـتان لەلایەن عوسمانی‌و سەفەوی‌یەکانەوه ٠٠ دەرەبەگایەتی کورد هەستی بــه ستەمی نەتەوایەتی کردووەو تا رادەیەکی زۆر دەستیان له تەعەسوبی مەزەبی هەلگرتووه ، که لەو سەردەمەدا پاشا زالمەکانی سەفەوی‌و سولتان بۆ قازانجی خۆیان پەرەیان پێ‌دابوو . ئەمـــیر خانی برادۆست یەکـــەم ئالاهەلگری ئەم بیره بووه ٠

مێژووی ( قەلای دمدم ) هەروەك ئەسکەندەر بەگی تورکمان که کاتبی شا عەباس بووه ڕووداوی ئــەو شەڕەی تۆمار کردوه له کتێبەکەی‌دا به ناوی « تەئریخی عالەم ئارای عەباسی » هەموو ڕوویەکی ئــەو جەنگــه دەگێرێتەوه ٠٠٠ بزوتنەوەی کوردەکان به سەرۆکایەتی خانی لەپ زێرین له پێناوی قەلای ( دم ـ دم ) دا کــه

(٣٧٠) سال لەمەوبەر لە ناوچەی ورمێ لە کوردستانی ئێراندا روویداوە ·· خانی لەپ زێرین لێپرسراوی ناوچەکانی تەرگەوەرو مەرگەوەرو ـ ورمێ ـ شنۆی کوردستانی ئێران بووە · سەرۆکی هۆزی برادوستیش بووە ··· خانی لەپ زێرین ویستی قەڵایەکی تر لە ناو قەڵای ( دم ـ دم )دا بە ناوی ( نارین ) دروست بکات، کاتێ شا عەباس بەمەی زانی کەوتە گومانەوە لە بەرەسەندنو پێشکەوتنی ناوچەکەو هەستی بەوەکرد لە ئەمانە دژی شان ... لەم سەردەمەدا (١٠) هەزار کوردی هۆزی جەلالی لە کوردستانی عوسمانییەوە بۆ ئێران هاتن ··· ئەمەش بۆ شا عەباس رێکەوتنێکی چاکبوو ، شا عەباس بریاریدا کە هەزار کەسیان لە ناوچەی برادۆست نیشتەجێبکات ··· بەڵام خانی لەپ زێرین دژی ئەم بریارە وەستاو ··· شا عەباس هێرشێکی زۆر گەورەی هێنایە سەر کوردەکان ··· بەڵام خانی لەپ زێرین نزیکەی چوار مانگ بەرگری لە قەڵاکە کردو لە پێناویدا رۆڵە نەبەزەکانی هۆزەکەیو رزگارکردنی خاکیان هەتا ناویان لێنەبرا یەك لەو رۆڵانە خۆی بەدەستەوە نەدا ·

« داستانی قارەمانێتیی کوردی خانی لەپ زێرین » کە بەرهەمی فراوانترین کۆمەڵانی خەڵکە ، بە پەیکەری خەباتی مەردانەی کوردانەوە دەژمێرێ بەرانبەر بە کۆیلەیێتیی شاکانی ئێران . لەم ئێپۆسەدا کەرەسەی راستەقینەی بۆ لێکۆڵینەوەی باری سەرنجی کۆمەلایەتیو سیاسیی گەلی کورد، لە کۆتایی سەدەی شازەهەم سەرەتای سەدەی هەڤدەیەمدا دەستدەکەوێ » (١٢) ·

« ئێپۆسی خانی لەپ زێرین نەخشەی خەباتی گەل بەرانبەر بە دەرەبەگی زۆردار دەکێشێ . سەر دارەمانی بە ناوی گەلی زەحمەت کێشەوە دەدوێ »(١٣) خانی لەپزێرین بانگی رۆڵەکانی دەبێ کە روو بە رووی شا عەباسو زۆردارانی راپەرن .. چونکە لە ئەنجامی وەڵامدانەوەی هێرشو هەرەشەی شا عەباسدا خانی لەپ زێرین وتوویە « ئەگەر ئەو شایە . منیش خانم » :

ئەو شایێ ئەمنیش خانم
خالەق یێ بە پشتیوانم
غولامی رەوێك شێرانم
قاتلی کوللی شیعانم .

هەر بۆیە شا عەباس ئاگری گرتووە لە شکری بردۆتە سەریو خۆی کوشتووەو ژنو منالەکانی بە دیلی گرتووەو ماڵو دەوڵەتەکەی بە تاڵان بردووەو سەربازەکانی شاو جەلالییەکانیش قەڵاکەیان گرتوە ..

رۆژێکی بەیانی بەردا
لەشکری شای هات لەسەردا
دایپۆشی بوو دارو بەردا
هات لەبن دم ـ دمی وردا

ئەم داستانەی کە لەیادی گەلدا ماوەتەوەو پارێزراوەو دەماودەم دەگێرێتەوە · خانی لەپ زێرین خۆیبە خەمخواری کوردانەوە دەزانێو ئامۆژگارییان دەکات کە لە دەسەڵاتی زۆرداران لە دوژمنی دەرەوەو ناوەوەو پارێزگاری لە خۆیانەوە بکەنو چاونەترسیو چاپۆك بنو · سەر بۆ شاو هۆزی جەلالییەکان دانەنەوێنن ·· خانی لەپ زێرین بە ئابدالّ بەگی کوری خورمز بەك دەڵێ کە رێگای باوکیان بەرنەدەنو قەڵاکە بەدەستەوە نەدەن :

ئابدالّ بەگە رۆڵەی بابی
بە من دەکەی چاك چاك دەبی
خان ئاودالّو کاکە خانە
گرتبوویان وەعدو پەیمانە
دەست هەڵناگرن لەو کارانە

* * *

خان ئابدالّو کاکە خانە
حەوت شەوانو حەوت رۆژانە
شەریان دەکرد بە شێرانە
شێران لە بانی کێلانە
لەش کەوتبوون مەکی گەردانە
خوێن رۆیی هەروەك جۆگانە
بالچوغەی شێران ئەمانە
شەهیدیان کرد کاکە خانە

لەگەڵ ئەمەشدا . وەك لە ناوەرۆکما دیارە خانی لەپ زێرین چیرۆکێکی پلەی دەرەبەگایەتییە (١٤) جا ئەوەی لەم شەرەدا ئاشکرایە ئەوەیە کە کوردەکان نزیکەی چوار مانگ بەرگرییان لەو قەڵایە کرد ·· ئاوی خواردنەوەیان لێبراو برسیەتیو نەخۆشی زۆربەی دانیشتوانی قەڵاکە مردن ، خانی لەپ زێرین هاواری مەردانە بەرانبەر بە شا عەباس دەکاو دەڵێ :

مە نە خۆفێ ئەسکەرێ تە
مە نە خۆفێ خانی تەوریزێ
گەلێ راناکا ژ هەمبێزێ
مە نە ترسا خانێ چێن مچینێ
قر ناکە خەلقێ مە

**تاجی تە قبووڵ ناکەم**
**کوردستانی بێ ناف ناکەم (١٥)**

ئەم داستانە لەناو بەشەکانی تری فۆلکلـــۆردا ڕەنگیداوەتەوە ئەوەتا بووە بە قسەیەکی نەستـــــەقی کوردیو دەماودەم لەناو کوردەکانی موکریاندا دەڵێن : « ئەگەر ئەم ـ دمی بۆ بلێی گریانی دێ » لە گۆرانیشدا دەڵێن :

**ئەی دم ـ دمی بەردی دەلان**
**جێگای خان ـ ئاودەلان**
**ئێستاکە بووی بە مەسکەنی خەرتەلان ·**

یاخود ئەو بەشەی فۆلکلۆر کە بە ناوی ( پەندی پێشینانە ) چەندەها پەندی بۆ دروستکردوین کـــە ڕەنگدانەوەی چەندەها ڕووداوی کاریگەرە لە مێژووی میللەتار کارێکی ڕاســـتەوخۆی کــــردۆتە ســــەر مێژووی عیراقدا ئەوگەلانەی کە ئێستالە دەژین لەم پەندەشدا ڕەنگدانەوەی کارەســـــــاتێکی مێــژوویی هەرچاوەکەوێ کە دەماودەم دەیترێ :

**شاران لە حەسرەت بەغدا دەکرا**
**بەغداش وێرانبوو ···**

بە هۆی ئەم پەندەوە دەتوانین بکەڕێینەوە بـــۆ سەردەمی هێرشە خوێناوییەکەی هۆلاکۆ بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو خاپوورکردنی شاری بەغدا ··· لــــەم پەندەدا ئەوە بەدی دەکرێت کــــــە شارستانیەتو ئاوەدانکردنەوەی بەغدا چ کارێکی کردۆتە ســــــەر شارستانیەتی وولاتانی ترەوەو ئەنجامی ئەو کارەساتەی لە بەسەر وولاتا هاتووە لە فۆلکلۆرەکەیدا ڕەنـــــگی داوەتەوە ·

چەوسانەوەو زوڵمو زۆرداری ئاغاو دەرەبەگەکان دژی جینە بەشخوراوەکان بەجۆرێك کاری تێکردووە کە دەنگی ناڕەزایی بەرزکەنەوە بەرامبەر هەڵسوکەوتی ئاغاو دەستو پێوەندەکانی · لەبەر ئەوە دەبوایـــــە گشت جوتیارەکان لە خزمەت ئاغا بوونایەو ئەرکیماڵو هەموو زەویو زارەکەشی لەسەر شانی ئەمان بوایە ··· ئەوەتا ئەو گۆرانییە کە تێکەلە بە شێوەی هەورامـــی نیشانەی تاڵی ژیانی ئەو جوتیارانەیە کە بەدەســـــت ڕەزا قولی خانەوە ناڵانـــدویانە ·· ڕەزا قولی خـــان یەکێکبوو لە خانەکانی ئەردەلانو دوای خسرو خـــانی والی ئەردەلان هاتۆتە سەر حوکمو بە زۆرداریو بەخیلو چاوچنۆکی ناوی دەرکردبوو · لە هەمان کاتیشدا چەند جوتیارێکی کوشتووە ·· یەکێك لەو ڕۆڵە جوتیارانەی کە مێژووی فۆلکلۆری ناوی تۆمارکردووە ـ چەمە ـ ناوێکبووە ·· هەرومك دەگێڕنەوە میرزا قولی خان بـــە خۆیو دەستو پێوەندییەوە دەچێ بۆ ڕاو ·· بــــــە ڕێکەوت ـ چەمەی ـ کوڕی جوتیاریان لەگەڵ دەبێ ··· لە کاتی پشوودانا بە دەمانچەی ( ساچمەزەن ) ڕەزا قولی خان دەکوژێو تۆڵەی باوکی بێتاوانی دەکاتەوە کـــە بە ناهەق ڕەزا قولی خان لە ژێر زەبرو زەنگی کارگردندا کوشتبووی ·· جا ئەم گۆرانیە هەمووی ڕەخنەیە لـــە زەمانو بە شخوراوانی چەوساندنەوە ···

**خودا منو تۆ بایتینە جواو**
**چاکەی تیا نەبی بەبێ چاو ڕاو**
**چل ساڵ لە سەریەلا ڕەمەزانم گرت**
**وە ئاو · وەنان پارشیۆم دەکرد**
**سەنەدی عومرم وەپەنجا گەیی**
**خۆشیم قەت لە ژێر سایەتا نەدی**
**ڕوژی چووەمە ماڵ ڕەزا قولی خان**
**سەد شەقیاندا لێم لەسەر تیکێ نان**
**چاوت لێمەوەبوو نەهاتیە جواو**
**ئێستا دەبێژی فلان پیاو غراو**

پاش برانەوەی شەڕی یەکەمی جیهانی ··· یـــا ئەو هەموو کوشتارو تالانو بڕۆیە · ئەو هەمــــــوو قاتوقڕەو ئەو هەموو کوێرەوەرییەو دەردو داخە · کە لە هەموو لایەك تووشی نەتەوەکەمان هات · هێشــــتا فۆلکلۆری ئەدەبی کوردی لە کوردستاندا برموو نرخی بۆ دادەنرا · چونکە لە هەموو گوندێکا خۆشخوانێـــك هەبووە کە ئەوان حەکایەتیان بۆ ئاغا ئەگردو لەشاییو داوەتا بەشداریان ئەکرد (١٦) · ئەم حکایەتخوانەش باسو خواسەکانی بریتیبوون لە بابـــەتی دڵداریو داستانی مێژوویی ·· یەکێ لەو داستانانەی کە لـــە داگیرکردنی عیراق لەسەردەمی ئینگلیزەکاندا دەدوێ ·· ئەو داستانەیە کــە باسی داگــیرکردنو کوشــــتاری فەرمانڕەواکان دەکا ··· بەڵێ هاتنی ئینگلیزەکان بـــۆ کوردستان ئەوەبوو یەکەمجار دەسەڵاتی خۆیان لــــــە ناوچەکە زۆر بکەن دژی عوسمانیەکان ··· هەر بۆیە دەستیانکرد بەیارمەدانی کوردەکـــانو تیژکــردنی سەرۆك هۆزە کوردەکانو بەگژا کـــردنی عوسمانیو فارسەکان ··· ئینگلیزەکان دەیانویست هەموو ڕەشو ڕووتی کوردستان بەڕەنجبەرو هەژارو ڕەمەکی خەڵکەکە وا تێبگەیەنن بە ئینگلیزەکان دۆستی کوردنو هەموو کاتێك پاڵ پشتی کوردن · هەر بۆیە پڕۆپاگندەکانیان

له سەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی دەنووسراو ئەوەیان بۆ کوردەکان ڕوون دەکردەوە کە « ئەو ئەقوامەی تابعی تورکن لە کورد مەغدوورتر نییە، تورك هەر خوێنیان دەمژن و مەحصولی سەعییان دەخۆن »(١٧) ·

هەر لە ساڵی ١٩١٨دا لە سەردەمی مێجەر نوئیل و ویلسن‌دا دەسەڵاتی پیاوە ماقووڵە تێگەیشتووەکانی کورد تا دەهات لە گەشەکردن و پێشکەوتنا بوو، بۆ وەدەستهێنانی مافی سەربەستی خۆیان هەر بۆیە فەرمانبەرە ئینگلیزەکان لە کوردستاندا هەمیشە هەوڵی ئەوەیان دەدا کە دەسەڵاتی شێخ مەحمود کز کەن. بە ڕێگەی هاندانی هەندێ لە سەرۆك هۆزەکانی ئەو سەردەمە ... ئەوەبوو ئەم هەوڵەی ئینگلیز سەری نەگرت ··· چونکە شێخ مەحمود زوو هەستی بە فروفێڵ و توندوتیژییەکانی مێجەر سۆنی حاکمی سیاسی و ڕاوێژکەری بەریتانیا کرد ·· توانی سەرۆك هۆزە کوردەکان کۆبکاتەوە وەك کەریمی فەتاح بەگ کە سەرۆك هۆزی هەمەوەند بوو لەگەڵ هەباسی مەحمود ئاغای پشدەر و مەحمود خانی دزلی و پاشان بزوتنەوەیەکیان دژی ئینگلیز دروستکرد ·· شێخ توانی مەحمود خانی دزلی ئاگادار بکا کە ئەویش بێتە سەلەیمانی ··· هەربۆیە لەگەڵ دەرکردنی فەرمانی شێخ مەحمود . مەحمود خانی دزلی بە خۆی و لەشکرێکی (٣٠٠) سواری هاتە سلێمانی و ترسێکی زۆری خستە دڵی مێجەرسون و لەگەڵ شێخ مەحمود نیشانەی شەڕی هەڵکردو لەگەڵ مەحمود خانی دزلی کەوتنە شەڕەوە لە ٢١/مایسی ساڵی ١٩١٩دا مەحموود خان توانی شاری سلێمانی بگرێ و نفوزی ئینگلیزەکان کزبکاو لە کاتی شەڕا سەربازە کوردەکانی سوپای ئینگلیز هەڵهاتن و چوونە پاڵ شێخ مەحمود لە جەنگی دەربەندی بازیاندا شەڕێکی خوێناوی دەستپێ کردو شێخ مەحمود لەم شەڕەدا بریندار بوو و بە دیل گیراو بەرەو بەغدا ڕەوانەکراو نزیکەی(٤٨) کەس شەهیدکران·· مەحمود خانی دزلیش لە قەرەهەنجیر گەمارۆی هێزی زۆری ئینگلیزیداو · جا ئازایی و فیداکاری ڕۆڵەکانی کورد بە فەرماندەی خانی دزلی نموونەیەکی پڕ شانازی مێژوویی کوردبووە کە ئەوپەڕی نیشتمان پەروەری و دڵسۆزی بەجێ هێناوە ·· ئەم ڕووداوە مێژووییە ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە شێخ مەحمود حاکمی سلێمانی چۆن لەگەڵ ئینگلیزەکان تێك چوو وە دڵسۆزەکانی شێخ مەحمود کۆبوون · هەموو بە جوانی لەو لاوکا کوردانەدا دەردەکەوێ کە دەماودەم دەگێڕنەوە

کاکی لاوکبێژ کاتی دەڵێ : -

دەلۆی - لۆی ، دەلۆی - لۆی ، دەلۆی - لۆی ،
دەلۆ - لۆی ··· شێخی زراف ·· وەڵڵە شادوشودێ
شێخ مەحمود کەکێ قادر ، بابێ لەتیف گەلەك هەنە ··
ب سێ دەنگا گازی دکر : کەریمێ فەتاح بەگ ،
ئێل و عەشیرەتێ کوردان ، بالو برا ، نێرو هوونێ
مێربن ، مێرێ چێ بن ··· ئەزێ ئێرۆ دەستێ خوە
یاڤێژمە داری جانبێزارێ ئەزێ بشکێنم شارێ
کەرکوکێ ، شاری سلێمانییێ ، وەژێ برەڤینم ··
( دەلۆی - لۆی ، دەلۆی - لۆی ، دەلۆی - لۆی ،
دەلۆی - لۆی ، لۆی شێخی زراف (١٨) ·

یان وەك ئەو لاوکەی کە وێنەی دەستپێکردنی شەڕو خۆئامادەکردنی شێخ مەحمود مان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ :

بابێ بابم شێخ مەحمود بە مەلیك دانرایە
بە خۆی لە چیاو چۆلان عەسکەری لە سەحرایە
تانی لەعەسکەریدا ، سونگی تاق ڕاوەستایە
هەموو سەیدی زەمانی بە خۆی وا لە گەردایە
کەریمی فەتاح بەگی عەسکەری تەعلیم دایە
لە دەورەی چەمچەماڵ دەبوە حەربو خەزایە
بە عام سپێران لێدەن ، سێ تۆپ وا دامەزرایە
کوردان چۆکو ببەستن ، پشت مەدەن لە خەزایە

• • •

بابێ بابم شێخ مەحمود ، شێخم بە گفتوگۆیە
چەند سەیدو مەلا کوژرا ، دەعوا لەگەڵ(سمکۆ)یە
حەفت ساران دەست بەسەربوو،لە شاری(هەتری‌ڕێ)یە
(١٩)

شایانی باسە ڕووداوی ئەم شەڕە کاوێسا ئاغا کە گۆرانی بێژێکی کوردە دەگێڕێتەوە :

لەم ( لاوك ) ەدا گۆرانی بێژ دەڵێ

شەرەکێ ل چیایێ سورداش لە مەریوانێ
لەمن خۆش‌دێ گرینێ تەیاران
ترقێنێ مەترەلیێوزان
گازە گازێ تۆپە داران
شێخ مەحمود بسێ دەنگان هاواردەکا
کەریمێ فەتاح بەگ ئەورۆکە
دەستهەڵێنانەکێ بکەین
ئەمن دەستێ خۆم بلەمە داری جانبێزارێ
بگرم شاری کەرکوکێ ·· شاری بەغدایێ

لە لایەکی تریشەوە لەم شەڕەدا ئەوە دەردەکەوێ کە شەریف یەکێك بووە لە سوارچاکەکانی شێخ

مەحمود • کە بەقەڵغانو ماینی باڵەبان شەڕی لەگەڵ ئینگلیزدا کردووە •• هەر بۆیە لەم گۆرانییە فۆلکلۆرییەدا دەڵێ :

**شەریف مەردەك بوو مەردی مەیدانێ**
**بە ئەسپی بۆرمەدەکا جەولانێ**
**تاڵانێ دەینا لە دیلەوانێ**
**قەڵغانی زەردە ماینی باڵەبان**
**دەنگی تەپلیان دێ لە گردی سەیوان**
**شەریف دەکوژن ڕۆڵەی پاڵەوان**

حکومەتی کەمالیستەکان لە ساڵی ١٩٢٥دا لە ئەنجامی ئەو ڕاپەڕینەی کە شێخ سەعیدو د . فوئاد کردیان •• بەسەر کوردەکانا زاڵبوونو شێخ سەعیدو د • فوئادیان بە دیلگیرانو شێخ سەعیدو کۆمەڵەکەی لە سێدارەدران ••• گۆرانی بێژان پشتاوپشت یادگاری ئەو شەڕو کوژراوانە دەگێڕنەوە کە وێنەیەکی ڕیالیستی هەستی خەڵکەکە دەنەخشێنن • لە تۆپبارانی شاری دیاربەکرو وانو بەتلیسو خارپوتدا •• دەنگبێژ بە لاوکە بە هێزو سۆزەکەی . خۆی دەخاتە مەیدانی شەڕەوەو خۆی بەخەم خەمبارو هاوبەشو هاورازی شەهیدانی مەیدان دەزانێ هاوار دەکا :

**« ئەی وەلاتۆ ، چ عەجیبو تۆلەکاتو گرانو گران بسەرێ کورداو کورمانجادا هاتۆ » •**

بەڵێ ئەم کارەساتە جەرگبڕە هەروەك بلەچ شێرکۆ دەڵێ : ژ ساڵا ١٩٢٥ حەتا ( ١٩٢٨ ) ، ١٤٠ ناحییا ژ کوردستانێ تورکیاو ٢٠٦ گوندی کورد وێرانکراو ٨٧٥٨ ماڵ ڕوخاو (١٥) هەزار مەریش زیاتر کوژران ••(٢٠)

بەڵێ حوکومەتی تورکیا هەر لە ساڵی ١٩٢٧دا بڕیاریدا کە کوردەکان بەرەو ڕۆژئاوا ڕەوانەبکاو نزیکەی نیو ملیۆن کوردی لە ژنو منداڵو لێقەوماوان بەرەو ( ئانادۆڵێ ) ڕەوانەکران (٢١) •••

جا هەروەك ڕوونمانکردەوە خۆشخوانانی کورد ئەم کارەساتەیان لە سنگدا تۆمارکردووە دەماودەم لە دیوەخانانندا بۆ کوڕەکانیان گێڕاوەتەوە •• دەبا بزانین ( سترانی میریا ) چ دەبێژێ دەربارەی شێخ سەعیدی پیران کە بە ناوی ( سەیید خان یا سەعید خان ) •• دەسەڵاتو زۆرداری کەمالیستەکان کۆمەڵەی شێخ سەعیدی ڕاپێچا لە دەشتی ( موشو چەمی بنانخیو سەرحەدو شاربیلجانیو وان ـ سێرتێ – تبلیس ئەکەنو هەموو شارەکان ئەگرێ ) گۆرانی بێژ ورد وردە کامێرای سەرنجی دەخاتە ناو شەڕەکانەوەو سەفەرو هێرشی تورك بۆ سەر کوردەکان یاددەکاتەوە :

**لۆ ، وەی لۆ ـ لۆ ، وەی لۆ ـ لۆ ـ وەلاتۆ**
**سەفەرا تورکا ئانادۆلی ژ کوردو کورمانجا داهاتۆ**
**باژارێ دیاربەکرێ ب سورە، ب بەدەنە ، ئەز نزانم**
**بتاوینە ، نزانم ئیستیقانا من ب سیپەرن**
**دەلوژینا شەر بنارێ ، ل گوهێ تۆپان**
**لەقە ـ لەقێ مەترەلویزان وژینێ مادۆلییانو**
**ئاناقاو تفنگێ ئینگلیزان •**

**هەی ل منێ ، هەی ل منێ . هەی ل منێ . هەی ل منێ ئەزێ ب دەشتا دیاربکر شەوتێ کەتم ، دلێ منێ ب حالێ منرا شەوتی گرانە دەنگێ تۆپو مەترالۆیزا ، ئەیارا ب شەبەقا سپێدا • ب سەر عەشیرێ کوردا هەرکی •**

**شێخ سەعید ئەفەندی یاڤێ عەلی رزا ل ئالییە ، کوردستانێ دکرگازی ،**

**دگو : « بابەکینۆ ، میرێ چبن ، چی بخەبتن ، میرێ ترکا بکوژن دەستهلینن ، دلێ من ب حەربا کوردو ترکا پڕ شەوتی •**

**هەی ل منێ ، هەی ل منێ . هەی ل منێ ، هەی ل منێ**

**گەلی عەشیرا کوردا هونێ گوه بدنێ**
**چەوا حەیفا منا ل وێ حەیفێ نایێ . چەوا بێ یاڤێ ترکا تۆڤێ ئەرمەنییا و کوردا قەلاندیە ژ دنێ(٢٢) •**

هەروەك ڕوونمانکردەوە گەلی کورد بەگەلێ پلەی مێژوویی و ڕووداوی گەورە گەورە بە درێژایی ڕۆژانی دروست بوونیەوە تێپەڕیوە . ئەگەر هێزی یەکیەتیو ورەو خۆڕاگرتنی تیا نەبوایە ئەوە لەبەردەم ئەو کارەساتو هێرشە خوێناویانەدا خۆی نەدەگرت •• جا لە ئەنجامی ئەو کارەساتانەدا گەلێ یادگاری پاڵەوانو گەورە پیاوان لە مەیدانی شەڕاوسوارچاکیو ئازاییو ئەترسیان مسۆگەر کردووە ••• گۆرانی ساڵحۆو جارەسم بەگ باسی تاوانو گوناهداری یاساو ڕژێمی دەرەبەگایەتیو ژێردەستەیی ڕۆمەکان دەکات ••• گۆرانیەکان هەموو بێزاریو ناهومێدیو یادگاری بووکێکی ناکامە • ـ کە هێشتا بە بووکی نەگوێزراوەتەوەو دەستگیرانەکەی دەگیرێ لە شاری دیاربەکر ئەرمایی گیرانی هەتا هەتایی بەسەرا دەدرێ •• ساڵحۆیەکی گەنجی تەمەن ( ١٨ ) ساڵان لەبەر زەبرو

زەنگی فەرمان رەواکانی تورکابێ دەسەڵاتو دۆستی نزیکی تەنها دەزگیرانەکەیەتی کە هەموو زێڕو سامانی بریتی بوو لەو زێڕانەی کە هەیەتی .. هەزار زێڕی لە مل خۆی فرێ ئەداو بریــــار دەدا بیدابە بەرتیــــل فەرمانبەرانی دادگا بۆ ئەوەی سالحۆ بەربێو بــــە خۆشیو بەختیاری بژین ٠٠ لە باڕانەوەکانیا ٠٠ لــــە کاتی لاوانەوەو پێ‌نەگەیشتنی داستانی پڕ غەمو هەنسك هەڵدەرێژیو دلخۆشی سالحۆ دەداتەوە کە غەم نەخوا٠ خەم خراپەو لە شاری دیاربەکـــــر بە بەرتیـــــل رزگاری‌دەکا ٠٠٠ هەر بۆیە بە سۆزەوە دەڵێ :

**لۆ – لو سالحۆ – پزمامۆ – ئەزێ ل دیاربەکــــر**
**بسەکنم ، ژ ئەنکەرایێرا ل تێلێ خم**
**ئەزێ فولانا زێرا فەکەو عەردێ خەم**
**ئەزێ هەزار زێرێ زەر ژڤولانا خوە دەرتینم**
**بەرتیلو رشوتا ب دایرێو مەحکەمێ خم**
**سالحۆ ، خەما نەخۆ ، خەم خراپن ، ئەز نەمریمە،**
**ئەزێ تە ژ حەپسا دیاربەکر دەرکەم**
**لۆ – لۆ سالحۆ ، پزمامۆ حەوشا ســــــەرایێ**
**کەفرێ بۆری ب بەرتیلو رشوەتا نووری سالحێ**
**خوە ژ حوکومەتێ کری**

لەم کارەی کە پێشکەشمان‌کرد رووبەکی گرنگی مێژووی گەلی کوردمان بۆ روون دەکاتەوە کە ئەویش خەباتی چینایەتی‌یەو هەوڵدان بۆ ژیانێکی خۆشــــترو لەبارتر لــــە چوار چێوەیەکی دیاری‌کراوی وولاتا ٠٠ رووداوە مێژووییەکان لە دەنگی کەسانێکەوە پێ‌دەگات کە زوربەی جەماوەری کورد پێك‌دەهێنن ٠ جا ئەوانەی کە لە بواری نووسینەوەو لێکۆڵینــــــەوەی مێژوو کاردەکەن لە سەریان پێویستە کە بایەخ بە فۆلکلۆر بدەن‌و لە رووی ئەوەی کە لە ویژدانی گەل هەڵقوڵاوەو هەمو دیاردە جیاوازی‌یەکانی ژیانی گەل بەهەمــــــور روویەوە دەردەخات ٠

## پەراوێزەکان

(١) خ ئابو ڤیان : کورد ڕۆژنامەی قەفقــــاس – تفلیس ١٨٤٨ ژمارە ٤٧ ٠ ل ١٨٨ ٠

(٢) عەرەب شەمۆ – قەڵای دم – دم پێشــەکی – بەغدا ١٩٧٥ ٠ ل ، ٣ ٠

(٣) محمدی مەلا کەریم – رۆڵی فۆلکلۆر لــــە دیارکردنی نیشانە = ناسینەوەکانی گەلی کوردا ٠ بەیان ٧ ژمارە ٣٠ . بەغدا – ١٩٧٥ – ل ٣٢–٣٣ ٠

(٤) سەرچاوەی پێشوو ٠٠٠ ل ٣٢ ٠

(٥) ئوردیخانی جەلیل ٠٠٠ سترانا زارکوتنــا کوردایە ( تاریقی ) . ل ١٠

(٦) سەرچاوەی پێشوو ٠٠٠ ل ١٠ ٠

(٧) تی ٠ ڤی ٠ ئەریستۆڤا ٠ کوردەکانی ئــەو دیوو قەفقاس ٠ مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ٠

(٨) ئۆردیخانی جەلیل ٠٠٠ ل . ١٧

(٩) ئۆردیخانی جەلیل ٠٠٠ ل ٤٩ – ٥٣ ٠

(١٠) رەشید هەورامی – گۆڤاری سلێمانی – ژمارە ١٠ ٠

(١١) ئەم گۆرانی‌یە فۆلکلۆریانە لەسەر شریت تۆمارکراوەو ئاوازەکانی بە ناوی سیاچەمانەیە .

١٢ – د ٠ عیزەدین مستەفا – لێکۆڵینــەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی – بەغدا ١٩٧٠ – ل ٤١–٤٣ ٠

(١٣) سەرچاوەی پێشوو ٠٠٠ ل ٤٢ ٠

(١٤) سەرچاوەی پێشوو ٠٠٠ ل ٤٣ ٠

(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٠٠ ل ٤٣ ٠

(١٦) ئوسکار مان – تحفة مظفرية – بــــەرگی یەکەم . ل – ١٧ بەغدا ، ١٩٧٦ ٠

(١٧) د ٠ کەمال مەزهەر ٠ تێگەیشتنی ڕاســتی ژمارە – ٣٨ – ١٩١٨ ، ل ١٢٦ ٠

لێکولینەوە لە لایەن د ٠ کەمال مەزهەر ٠

(١٨) ئوردیخانی جەلیل ٠٠٠ ل ٥٨ – ٥٩ ئــەم هۆنراوەیەم لە مانگی ئازاری ١٩٧٠ دا لە یەریڤان لــە زمانی هۆڤ سپیان کاراپیت نووسیووەتەوە ٠

(١٩) بەندی شێخ مەحمـــــود ، هاوکاری ٧–١٢–١٩٧٣ ٠ ئەم لاوکە لە لایەن شایەری هەولێــر ( عەولای حەمەدەمین ) وتراوە ٠

(٢٠) بلەچ شێرکۆ – القضية الكردية – قاهــرة ١٩٣٠ ٠ ل ٥٢ ٠

(٢١) ئوردیخان ٠٠٠ ل ٢٣ ٠

(٢٢) ئوردیخان ٠٠٠ ل ٧٧–٧٨ ٠




لەگەڵ نووسینو خوێندنەوە سەری هەڵدار بەرەی سەند ، زۆر زو؛ هەندێ لە نەتەوەکانی سەر رووی زەمین کاری رۆژنامە نووسی یان ناسیوە بێ گومان ئەم ناسینە بە شیوەیێکی زۆر سەرەتایی‌و ساکار بووەو بەتایبەتی لای میسری‌و چینی یەکۆنەکانو هەروەکو دوکتور کەمال مەزهەر دەڵێ :

« رۆژنامەو رۆژنامە نووسی‌ی مێژوویەکی دوورو دێژی پڕ لە رووداوو ناڵو گۆڕیان هەیە · لە شارستانیەتی کۆندا چەند نموونەیەکی سەیر هەیە کە هەریەکەیان بەجۆرو شێوازێك لە رۆژنامە دەکەن ، یان بەلای کەمەوە بە خزمایەتی پێ‌ی دەگەنەوە ·

چەند هەزار سالیك لە مەوبەر فەرمانڕەوا کۆنەکانی میسر کاروباری وڵاتو شەڕەکانی سوپاو گەلێك شتی تری لەو بابەتەیان بە شێوەیێکی رازاوە لەسەر بەرد هەڵدەکەندو دوایی لەگەڵ خۆیان دەیان ـ بردە ناو گۆڕەوە ، یان بۆ ئەوەی دوای خۆیانیان بەجێ دەهێشت »(١) ·

دیارە مرۆڤایەتی زۆر زوو لە دەوری گرنگی رۆژنامەو رۆژنامە نووسی‌ی گەیشتوە ··· بەڵکو سەرهەڵدانی‌و گەشەکردنی رۆژنامە نووسی‌ی ، شارستانیەتی پێش‌خستووە ·· بۆیەکا هەر لە سەرەتاوە شوێنی دیاری کراوی بۆ خۆی پەیدا کردووە ·· تاوای لێ هاتووە چەند سەرکردەو پیاوە مەزنەکانی جیهان بە چاوێکی رێزو ترسەوە تەماشای رۆژنامە نووسی‌ی بکەن ، لەم بوارەدا نموونە گەلێك زۆرە ، قسەی بەناوبانگەکا وەك : « ناپلیون ، تولستوی ، ڤولتیر ، دیازی سەرکۆماری مەکسیکو دەیانی دیکە »(٢) ·

بەڵگەیەکی پتەوی بۆ چوونەکەمانە ·

ئیتر هەرچەند کۆمەڵی مرۆڤایەتی پێش‌کەوتووە ، رۆژنامەو رۆژنامە نووسی‌ی رێچکەکەی بەرینترو دەورەکەی گەورەتر بووە ··· بەڵکو خودی رۆژنامە نووسی‌ی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا لەگەڵ ئەو هەموو دەزگا جۆر بە جۆرەی راگەیاندن وەك : « رادیو ، سینەما ، تەلەفزیونو مانگی دەستکرد » دەوری رۆژنامە نووسی‌ی فرە گرنگ بووە · بگرە لەم رۆژگارەدا وولاتانی گشت دنیا بایەخێکی ئێجگار زۆری پێ دەدەنو پارەو سەرمایەیێکی بێ‌ئەندازەی بۆ تەرخان دەکرێ لەلایەن فەرمانڕەواکانی جیهانو ئەو کارتیلو کۆمپانیایانەی کە بە سەدان رۆژنامەو گۆڤارو دەزگای دیکەی راگەیاندن بەڕێوە دەبەن هەروەها مێژووی جووڵانەوەی شۆڕشگێرانەی خۆیی‌و جیهانی بە توندی ئەم دەورەی رۆژنامە نووسی دەسەلمێنن ·

ـــ هەر لەم روانگەوەش لە دەمێکەوە رۆشنبیرانی کورد بەپێ‌ی بارو ئاستی رۆشنبیری‌و سیاسی سەردەمی خۆیان ، هەستیان بە مەزنی دەوری رۆژنامە نووسی

کردووە ، لێرەدا دووبارەی دەکەینەوە ، کە چۆن نەوەی بەدرخانی‌یە کورد پەروەرەکان لە پێناوی دەرکردنی ڕۆژنامەی کوردوستان چەند ژانیان چێشتوەو ئەم وڵاتو ئەوی دیکەیان کردووە(٣) .

ـــ جا هەرچەندە ئەم پێشەکی‌یە زۆر خەستو بە پەلە بوو . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وابزانم تیشکێکی ڕووناک بوو . دەربارەی ڕۆژنامە نووسی لە ژیانی کۆمەڵدا .. ئێستا کەش بەچەند دێرێك باسی سەرهەڵدانی ڕۆژنامە نووسی‌ی کوردی دەکەم . ئەوەی ئاشکرایە ، یەکەمین ڕۆژنامە لە مێژووی نەتەوەی کورد دا دەرچووە ، ڕۆژنامەی کوردوستان بوو . کە لە ٢٢ـ٤ـ١٨٩٨ لە شاری قاهیرە لە لایەن میقداد مەدحەت بەگەوە دەرکراوەو سێ ویەك ژمارەی لێ دەرچووە(٤) .

ـــ دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردوستان ، پەیوەندیێکی بە هێزی بەچەند هۆیێکی گرنگەوە هەیە ، کە هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ باری ڕۆشنبیری‌و سیاسی کۆمەڵی کوردەواری‌و هەندێکی دیکەشیان بە بارو ئاستی ڕۆشنبیری‌و سیاسی جووڵانەوەی ئازادیخوازانەی گەلانی دراوسێی کوردەوە هەیە ..

ـــ دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردوستان نیشانەی سەرەتای قۆناخێکی نوێ بوو لە خەباتی ڕزگاری خوازانەی نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌ی کۆمەڵانی خەڵکی کوردوستان هەروەك دوکتور عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ دەڵێ : « بە دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستان ڕوشەی تێکۆشەر لە ڕێگای ڕۆژنامە نووسی‌یەوە هاتە کۆڕی خەبات »(٥) .

ـــ لە یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردوستانەوە تا ئەم ڕۆژگارەمان . ڕەوتی ڕۆژنامە نووسی کوردی بەشێکی پڕ شکۆی مێژووی خەباتی دوورو درێژی نەتەوەی کوردە لە سەرانسەری کوردستان . هەروەها ڕەنگ دانەوەی هەڵوێستو باری سیاسی ئەو میللەتانەی کە لەگەڵ کورد دا ژیاوون ...

لە هەمان کاتدا ئەنجامی زوڵمو زۆرداری دەوڵەتی دواکەوتوی عوسمانی‌و ئیمپراتۆریەتی فارس‌و بەرپابوونی یەکەم شەڕی جیهانی‌و ئەنجامی دووەم شەڕی جیهانی یە .

ـــ بە کورتی : « مەسەلەی ڕۆژنامە نووسی کوردی بەشێکە لە ژیانی ڕۆشنبیری کوردو خەباتی درێژ خایەنی نەتەوەکەمان کە سەرهەڵدانی‌و چۆنێتی



## ساغ کردنەوەو لێکۆڵینەوەی

**ممتاز حیدری**

دوروست بوونی جووڵانەوەی ئازادیخوازانەکەی زۆر ئاڵۆزەو دووانو لێکۆڵینەوە دەربارەی بێ‌گومان زۆر ئاسان نی‌یە جا دەربارەی دوروست بوونی مێژووی ڕۆژنامە نووسی کوردو گشت قۆناغو گیروگرفتە سیاسی‌و نەتەوەیی‌یەکانی لە تەك دەورو پلەی ڕۆشنبیریتی‌و هونەری دا نەك تەنیا لەچەند دێرێك‌و لاپەڕەیێك بە سووچێکی مانی خۆی ناگات . بەڵکو بۆ باس کردنی‌و لێکۆڵینەوەی پێویستی بە چەندین کتێبو نامیلکەی سەربەخۆی هەیە »(٦) .

ـــ جار پاش ئەم پێشەکی‌یە دەست بە باسە سەرەکی‌یەکە دەکەم .

هەروەکو گوتمان : ڕۆشنبیرانی کورد ئازارو ژانێکی زۆریان چەشتووە تا بناغەی ڕۆژنامە نووسی کوردیان دامەزراندوە ژمارەیێکی زۆر لە دڵسۆزو نیشتمان پەروەرانی کورد لە تاریکی شەوە زەنگی نەتەوە دا وەك چرایێکی ڕۆشن شەقامی ژیانو خەباتیان ڕووناك کردۆتەوە . لە وانە کە بە نەمری لە مێژووی ڕۆشنبیری‌و نەتەوەی کە لەگەڵمان تۆمار کراون‌و هەرگیزاو هەرگیز قەرزیان پێ ناکرێتەوە وەك :

« میقداد مدحت بەدرخان . عەبدوڕەحمان بەدرخانی برای . پیرەمێردو مستەفا پاشا . علی کەمال، م . نوری . خواجە ئەفەندی زادە . ئەحمەد سەبری ، سالح زەکی ساحێب قران . مستەفا شەوقی . حوزنی موکریانی . جەلادەت بەدرخان . کامەران عالی بەدرخان گۆران‌گیوی موکریانی‌و بەدەیانی دیکە » .

ـــ بەردی بناغەی جووڵانەوەی ئازادیخوازانەو

دیموکرات پەروەری پێشکەوتنخوازانەی ئەمڕۆی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان . نەك تەنیا کۆشش و خەباتی ڕێکخراوێکی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و نیشتمان پەروەری کورد بووە . کە لە ساڵانی بیستەکانی ئەم سەدەیە دا . دەوری کاریگەری خۆیان گێڕاوە بەڵکو بە دەیان نیشتمان پەروەرو ئازادیخوازانی کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەوە لە ڕێگای هەوڵ و کۆششی شەخسیانەوە خزمەتی نەتەوەکەیان کردووەو کردەوەکانیان بوەتە هەوێنو سەرچاوەی پێشکەوتنی کۆمەڵی کوردەواری لە ڕووی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و سیاسیشەوە .

— شۆڕە سوارێکی ئەم مەیدانە پیرۆزەی ڕۆژنامە نووسی . مستەفا شەوقی بووە ... وەك سەربازێکی نەناسراو لە دژی دواکەوتن و زوڵم و زۆرداری نەتەوەی جەنگاوە . بە پێی ئەو بەرهەمە بچکۆلانە گەورەیەی بەجێی هێشتووە . کە گۆڤاری « پەیژە » یە دەردەکەوێ ڕۆشنبیرێکی نەتەوە پەروەر بووە ، لە ناخی دڵیەوە شەیدای وشەو زمانی کوردی بووە . بەڵکو تێکۆشەرێکی ڕێگای کامەرانی و سەرفرازی خاك و نەتەوە بووە .. ئەم رایەمان بە بەڵگە دەسەلمێنین پاش ئەوەی ناوەرۆکی نوسینەکانی بە پێوانەیێکی مەوزوعی و « ڕاستی » مێژوویی شی دەکەینەوە .

ئەوەی شایانی باسە . بەداخەوە تا ئێستا کەم باسی گۆڤاری پەیژەو مستەفا شەوقی کراوە(٧) . تەنانەت لە هەندێ سەرچاوەی ڕۆژنامە نووسی و مێژوویش ناوی نە هاتووە(٨) .

خودی باسەکە ئەو ناونیشانەی دیار کرد ، لەبەر ئەوەی گۆڤاری « پەیژە » یەك ژمارەی لێ دەرکراوە ، هەرچەند ئەم ژمارەیەش بە پێی ناوەرۆك و ئاستی ڕۆشنبیری و هەستی نەتەوەپەروەری کەلێنێکی تایبەتی لە ڕەوتی ڕۆژنامە نووسیدا هەیە بۆ ئەم دەست نیشان کردنەش جگە لەشی کردنەوەی ناوەڕۆکی گۆڤارەکە . پێویستە بە وردی سەرنجی باری ڕۆشنبیری و سیاسی ئەوسای کوردو وڵاتی عیراقی بدەین . لەگەڵ ئەوەشدا بە دڵنیاییەوە دەڵێم کەلێنێکی پڕ بە پێستی خۆی گرتۆتەوە .. بەڵام بۆ ناوی مستەفا شەوقیم خستۆتە پێشەوە . چونکە بە پێی ناوەرۆکی گۆڤارەکەو بەڵگەی تریش کە دوایی لێی دەدوێین . مرۆڤێکی کەم وێنەی سەردەمی خۆی بووە .. بەڵکو لەلایەنی ئاستی ڕۆشنبیری و ئاستی بیرکردنەوەی زۆر لە سەردەمی خۆی پێش کەوتووتر بووە ، بۆیە هەر دووکیانم بەیەکترەوە بەستۆتەوە . واتە مستەفا شەوقی و گۆڤاری پەیژە . چونکە لە ڕۆژنامەیێك یان گۆڤارێك دەکۆڵدرێتەوە ناوی خاوەن و دەستەی نووسەرانی ئەوەند باس ناکرێ . ئەوەندەی باسی ناوەڕۆك و دەوری ئەو ڕۆژنامەیە یان گۆڤارەکە دەکرێ .. بەڵام لێرە دا چونکە مستەفا شەوقی دەورێکی زۆر سەرەکی هەیە . بۆیە دەڵێم خودی باسەکە ئەو ناونیشانەی دیاری کرد .

— لێرە دا بۆ سەلماندن لەمەڕ دەوری گرینگی کۆمەڵانی خەڵك یان تاکە کەسێك ، ڕایەکی پەسندی « جونهوهنبرگ » دێنمەوە کە دەڵێ :—

« ڕاستە ڕۆژنامە » گیان و لەشە . بەڵام کۆمەڵانی خەڵك دڵە زیندووەکەیەتی . هەر ئەوانەن — واتا کۆمەڵانی خەڵك م . ج — ژیان و گەرمایی بەم گیان و لەشە دەبەخشن . چونکە هەر ئەوانەن ڕێبازو ڕەوتی ڕۆژنامەنووسی دەستنیشان دەکەن »(٩) .

لایەنی هونەری و قەبارەو شێوەی دەرهێنانی بە کورتەی بارستایی چاپ کردن و دەرهێنانی هونەری ڕۆژنامە نووسی بەر لە — ٥٣ — ساڵ خراپ نیە ، بەڵام تارادەیەك چاپەکەی لە ئاستێکە دەکات .. قەبارەی « ١٢ سم » بە « ١٩ سم » ٥ کاغەزەکەی بۆرە . ناوەکەی لە ناوەڕاستی سەرووی بەرگەکەی بە دەستخەت « کلێشە » بەرەنگی سوور چاپ کراوەو لە ژێر ناوەکەیدا نووسراوە : « ژمارە — ١ — ئەدەبی ئیجتماعیە بە کوردی بۆ کوردایەتی ئەدوێ . دانەری مستەفا شەوقی ، حقوقی چاپ بۆ دانەریەتی . مەتبەعەت ئەلفورات ، بەغدا ١٣٤٥ ك — ١٩٢٧ ز » جگە لە بەرگەکەی — ٤٤ — لاپەرەیە لە دوا بەرگیشی نووسراوە :

« جێگای فرۆشتن و موخابەرە . بەغدا : مەیدانی تونچی شاکر موجرم — مستەفا شەوقی .. لە بەغدا بە هەشت لە دەرەوە بە نۆ ئانە ئەفرۆشرێت »(١٠) .

ئەوەی تا ئێستا بۆ من ئاشکرا بووبێ دەربارەی کەسیەتی و ژیان و شوێنی مستەفا شەوقی زۆر کەمە .. هەر چەند لەم ڕووەوە هەوڵم داوە . بەڵام زانیاریەکی تەواوم وە دەست نەهێناوە .. تەنانەت ساڵی ١٩٧٧ لە ڕۆژنامەی « العراق » دا بانگەوازێکم بڵاوکردەوە . بۆ ئەوەی هەر کەسێ شتێك دەربارەی دەزانێ پێم ڕابگەیەنێ(١١) . لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ زانیاریم وە

ـست کەوت هەر چەند هەندێکیان یەکتری ناگرنەوە..
ـە ساڵی ١٩٧٢ دا لە مامۆستا « شاکر فەتاح » م
ـرسی ئەویش لە وەڵامدا گوتی « مستەفا شەوقی
ـعـەرێکی نیشتمان پەروەری کورد بووە . لە پاش
ـروخانی دەوڵەتی عوسمانی گەڕاوەتەوە کوردستان
ـدی فەرمانی میری نەکردووە . بەڵکو لە پێناوی
ـێش کەوتنی نەتەوەی کورد هەردەم لە خەباتدا بوە»(١٢)

مامۆستا گیوی موکریانی بەر لەوەی کۆچی دوایی
ـکات لێم پرسی . ئەویش گوتی : « پاش گەڕانەوەی
ـە ئەستەموول . وە لە ڕەواندوز کرا بە زابتی تەجنید
ـموێ ـ واتە لە ڕەواندوز ـ بە نەخۆشی دڵ وەستان
ـرد »(١٣) .

ـــ بەرێکەوت رۆژی شەممە رێکەوتی ٢٢ـ٢ـ٩٨٠
چووم بە مامۆستا شەمسەددین سلێمان صلاح شـوز
کـەوت . کـە لە بنەماڵێکی ناوداری ڕەواندوزە .
دەربارەی مستەفا شەوقی لێم پرسی : مامۆستا
شەمسەددین سلێمان گوتی : « من دەیناسم . زابتی
تەجنید بوو لە ڕەواندوز . من ئەو کاتە بەڕێوەبەری
شارەوانی ڕەواندوز بووم . رۆژێکیان لە پڕێکا دڵی
وەستاو مرد . وا بزانم ساڵی ١٩٣٨ یان ١٩٣٩ بوو..
بەڵام نازانم تەرمەکەیان بۆ کوێ برد . مرۆڤێکی زۆر
ـسەر خۆو ئاقڵ بوو . نەخۆشی زەعنی خوێنی هەبوو
ـەبـەر نەخۆشیەکەی زۆری پێ ناخۆش بوو کـە
ـەڕەواندوزە » هەروەها مامۆستا شەمسەددین گوتی:
« پیاوێکی سوورو سپی چوارشانە بوو »(١٤) .

دکتور مارف خەزنەداریش لێکۆڵینەوەیێکی لە
ژێر ناونیشانی « شیعری سیاسی کوردی لە
کوردستانی عیراقدا ماوەی نێوان هەر دوو جەنگی
گێتی » لە گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ژمارە ـ ١٥ ـ
ساڵی ١٩٧١ـ١٩٧٢ دا بڵاوکردۆتەوە . لە نێوان ئەم
لێکۆڵینەوەیە دا شیعرێك بە ناوی مستەفا شەوقی لە
ژێر ناوی«هاواری دایکێ»لەگەڵ پێشەکیێیکی پەخشانی
بڵاوکـردۆتەوە . جا لـە پەراوێزی لێکۆڵینەوەکەیدا
ژمارە ـ ١٥ ـ دکتور مارف دەڵێ : « مستەفا شەوقی
خەڵکی سلێمانی بووە . ماوەیەك لە ئەستەمبووڵ ژیاوە،
شاعیرێکی نیشتمان ـ پەروەربووە خاوەن زەوق
بوە »(١٥) .

کەچی دەبینین دکتۆر مارف لە رایەکی پێشووی
پاشگەز دەبێتەوە کە زۆر راستە (م . ح ) ـ دکتـور
مارف وتارێکی لە ژێر ناویدوو ناونیشان لە گۆڤاری
رۆژی کوردستان ژمارە ٤٣ و٤٤ی ساڵی ١٩٧٦ـ١٩٧٧
لە لاپەڕە ٣٨ـ٤٦ بڵاوکردۆتـەوە . جا لە پەڕاوێزی
ژمارە ـ ١٤ ـ دا دەڵێ : « ئەو زانیاری‌یەی لە ناوەوە
بێ لەبابەت ئەم شاعیرەوە ـ مەبەستی مستەفا شەوقی
یە (م . ح ) ـ ئەوەیە کـە پارچە شیعرێکی بە ناوی
« هاواری دایکێ » لەگەڵ پێشەکی‌ێیکی پەخشـان
بڵاوکراوەتەوە ، وەبە خەڵکی سلێمانی ناسراوە »(١٦) .

دکتـور مارف هەر لەم پـەراوێزە دا دەڵێ :
« لێرەدا پێویستە هەڵەیێکی خۆم راستبکەمەوە لەو
وتارە دا شاعیرم بەخەڵکی سلێمانی داناوە راستی‌یەکەی
مستەفا شـەوقی لە بنەماڵەی « قازی » ی شـاری
سابلاغی «مەهاباد» کوردستانی ئێرانە . لە ئوسلووبی
شیعرەکانیشی هـەندێ ئەدگاری شێوەی ناوچـەی
موکریان دیارە . زیاد لەسەر ئەمەش لە رۆژنامەکـە
شاعیر خۆی نووسیویەتی قازی زادە شەوقی » !(١٧) .

جارێ بەر لە هەموو شتێك . دەبوایە دکتـۆر
مارف بە پێی شیعری « هاواری دایکێ » بڵێ مستەفا
شەوقی خـەڵکی کوردستانی ئێرانە ، نەك خـەڵکی
سلێمانی یە ، چـونکە ئەو شـیعرە زیاتر ئەدگاری
شێوە موکریانی پێوە دیارە ، نەك شێوەی سلێمانی .
جا چ لەبـەکار هێنانی « پێتە قالبی دەی پێش‌کـری
فـرمانی رانەبووردوو ، یان ناوهێنـانی « بەندێ ـ
بەیتی ـ برایمۆك » یا هەندێ وشە کە زیاتر لە شێوەی
موکریان باوە وەك : « دەستر ، دەبن ، تاو ، لابـە ،
شاپوور ، بابت ، نێو »(١٨) . من گومان دەکـەم ،
ئەم شیعرە ، واتا « هاواری دایکێ » هەر لە بنەڕەتدا
هی مستەفا شەوقی بێ ، هەر چەند لەبیستو چوارەم
دێر دا وشەی « شەوقی » هاتووە ..

سەیر ئەوەیە دکتۆر مارف خۆشی بەگومانەوە
دەڵێ : « من لە دەستنووسەکەی مامۆستا نەجمەددین
مەلا وەرم گرتووە ، کـە لە رۆژنامەی ژین ، ئەوەی
ساڵی ١٣٣٧ کۆچی ١٩١٩ زاینی لـە ئەسـتەموول
دەرچووە»(١٩) .

دکتۆر مارف بۆ پاکانەی پاشگەز بوونەوەکـەی
دەڵێ : « ئـەوەی لێرە دا سـەرنج رادەکێشێ و
پێویستی بەلێکۆڵینەوە هەیە ئـەوەیە کە لە سەرەتای
سەدەی بیستەم و دوورو بەری جەنگی جیهانی یەکـەم
لە پایتەختی عوسمانی دا رۆڵەی هـەموو ناوچەکانی
کوردستان بزووتنەوەی نەتەوایەتی دا بە شداربوون ،
تەنانەت کوردی کوردستانی ئێرانیش هاوکاری ئـەم

خەباتە بوون »(٢٠) ·

بێگومان بە پێی باری ئاڵۆزاوی نەتەوەی کورد زۆر لایەنی مێژووی رۆشنبیری و سیاسی بە ئاسانی ساغ نابێتەوە · چونکە لە وانەیە سەرچاوەی نەزانراو بدۆزرێتەوە زیاتر ساغ بێتەوە زانیاری راستەقینە شوێنی خۆی بگرێتەوە ·

بەڵام لێرەدا مایەی داخە دکتۆر مارف تەنیا بە یەك وشە · واتا وشەی « قازی زادە » · مستەفا شەوقی لە خەڵکی سلێمانی یەوە کردووە بە خەڵکی سابلاغ !؟ لە کاتێکدا چەند بەڵگەی پتەو لە ئارشیفی رۆشنبیری و رۆژنامە نووسی کوردی دا هەن کە بەڵگەی ئەوەن مستەفا شەوقی خەڵکی کوردستانی عیراق بووە ·

من لێرە دا بەر لەوەی زانیاری چەند کەسێکی دیکە تۆمار بکەم · هەروەها لە نێوان بەرهەمەکانی بەهێنم باری سەرەندێ خۆم لەمەر ساغ کردنەوەی مەسەلەی مستەفا شەوقی کە خەڵکی کوردستانی عیراق بووە دەخەمە روو :

★ یەکەم : کوردستانی ئێران بەهیچ جۆرێك ئەوساکە پەیوەندی بەدەوڵەتی عوسمانییەوە نەبووە · تاکوردەکانی ئەوێ لە رێگای وەزیفەو هۆی دیکەوە چوبنە ئەستەمول یان لەوانەیە زۆر بە دەگمەن بوو بێ ·

★ دووەم : گەڕانەوەی مستەفا شەوقی بۆ وولاتی عیراق وەك زۆربەی زۆری کوردەکانی کوردستانی عیراق ·

★ سێیەم : بە گشتی لە نووسینەکانی مستەفا شەوقی ئەدکاری شێوەی موکریانی تێدا بەدی ناکرێ، بەڵکو کتومت شێوەی سلێمانی یە(٢١) ·

★ چوارەم · هیچ باسێك لە گۆڤاری پەیژە پەیوەندی بە کوردستانی ئێرانەوە نییە · چونکە ئەگەر خەڵکی ئەوێ بوایە شتێکی هەر دەنووسی · جگە لەوەی ئەوانەی لە گۆڤاری پەیژە نووسیویانە هەموویان خەڵکی کوردستانی عیراقن : دیسان ئەگەر وا بوایە هەوڵی ئەوەی دەدا نووسەرێکی کوردستانی ئێرانیش هاوبەشی بکات ··

★ پێنجەم : بۆ زێدە سەلماندن · مستەفا شەوقی، لەوتارێکی لە ژێر ناوی « گفتوگۆ » لە گۆڤاری پەیژە دا بڵاوی کردۆتەوە دەڵێ : « جەمعیەتی ئەقرام بۆ میللەتی کوردو بە تایبەتی بۆ ئێمەی کە بە کوردستانی جنوبی ناسراوین قراری خۆی داوە · ئەو قرارە کە بۆ ئێمەیە لە دوومین ژمارەی رۆژنامەی بانگی کوردستانا هەندێکی نووسراوە ··· هتد »(٢٢) ·

ئەوەی مایەی سەرنجە لە بۆچوونەکەی دکتور مارف دا ئەوەیە کە دەڵێ : « شیعرەکانی » لە کاتێکدا تەنیا یەك شیعر لە رۆژنامەی کوردستان بە قازی زادە شەوقی هەیە · جا بە هۆی وشەی « شەوقی » داوەیتە پاڵ مستەفا شەوقی ··

هەرچەند ئەو دوو شیعرەی کە بە ناوی «هاواری دایکێ» لەو «جەوانان» هەر دوو شیعری چاكو بە هێزن ·· جا یەکێك خاوەن ئەم چەشنە شیعرانە بێت، دەبێ شیعری زۆر بێ · ئەگەر وا بوایە بۆچی کەس باسی شیعرەکانی دیکەی نەکردووە · تەنانەت دکتور مارفیش زیاتر لەو دوو شیعرە باسی شیعری دیکەی نەکردووە ·· یان مستەفا شەوقی شاعیر بوو بێ و شیعری زۆر بووە بۆچی نەك شیعرێك · بگرە تاکە دێرێك ی لە « پەیژە » بڵاو نەکردۆتەوە · کەچی پیشەکێ یەكو چوار وتاری لەم یەك ژمارەیە دا بڵاو کردۆتەوە · نەك تەنیا هەر ئەوە · بگرە وەك سەر نووسەری رۆژنامەی « بانگی کوردستان » ی مستەفا پاشا بووە لەویش هیچ دێرە شیعرێکی بڵاو نەکردۆتەوە ·· کەواتە قازی زادە شەوقی · مستەفا شەوقی نییە · بەڵکو یەکێکی دیکەیە ·

★ رۆژی یەك شەممەی رێکەوتی ١٠ی نیسانی ١٩٧٧ دەربارەی مستەفا شەوقی لە مامۆستا « عەلائەدین سەجادی » م پرسی · ئەویش گوتی « مستەفا شەوقی خەڵکی سلێمانی بووە · وەزیفەی مەدەنی دیوە » ·

★ دکتور عیزەددین مستەفا رەسول رێکەوتی د_٢_١٩٨٠ لە شاری هەولێر بوو · لێم پرسی مستەفا شەوقی کێیە ؟

ئەویش گوتی :

« مستەفا شەوقی · زابتێکی خەڵکی سلێمانی بوو · لە سوپای عوسمانی کاری کردوەو پاشان گەڕاوەتەو بۆ عیراق و لە سوپای عیراق دیسان کاری کردووەو پلەی « مقدم » رۆیشتوە خزمی لە سلێمانی هەن یەکێکیان بە « محي‌الدين دگل » ناوی دەرکردووە · خوشکەزای بووە · « محي‌الدين » کۆنە لەنگە ـ فرۆش بووە » · هەروەها دکتور عیزەددین

رنی من بە منداڵی چەند جارێك دیوومە . چونکە کە دەهاتە سلێمانی لە ماڵی « محي‌الدین دا دەبەزی ئیمەیش دراوسێیان بووین »(٢٣) .

ـــ دووبارە ڕۆژی یەك شەممەی ڕێکەوتی ٢٤ــ٢ــ١٩٨٠ لە مامۆستا « شاکر فەتاح » م پرسی . گوتی :ـ

« مستەفا شەوقی مرۆڤێکی زۆر بە تواناو کورد پەروەر بوو . هەرتەم هانی لاوانی کوردی دەدا، خەڵکی سلێمانی بووە . وابزانم ماوەیێك کرا بە رابتی تەجنید » .

ئەنجام : بە پێی زانیاری ئەو کەسانەی ناوم بردن و هەروەها بە گوێرەی باری سەرنجەکانم بێ‌گومان مستەفا شەوقی خەڵکی کوردستانی عیراق و بەتایبەتی شاری سلێمانی بووە .

## ● مستەفا شەوقی ڕۆشنبیرێکی نەتەوە پەروەرو ڕۆژنامە نووسێکی هوشیار بووە ...

مستەفا شەوقی هەروەکو خۆی لە پێشەکی‌یەکەی « پەیژە » دا دەڵێ : « تەمەنم هەشت ساڵان بووە کە لە کوردستان دوور کەوتوومەتەوە »(٢٤) .

دیارە بەر لەوەی بچێتە ئەستەموول ماوەیەك لە بەغدا ژیاوەو لەوێ فێری زمانی عارەبی بووەو چاوی کراوەتەوە واتا هەر لە بەغداش خوێندویەتی . پاشان چۆتە ئەستەموول لەوێش لە سوپای عوسمانی .. بۆتە ئەفسەر مانەوەی لە ئەستەموول زۆر کاری لێ کردووە . ئاسۆی بیرکردنەوەی فرەوان بووەو شارەزاییێکی باشی لە کاروباری دونیاوە دەست هێناوە .. تەنانەت لە هەندێ نووسینەکانی وەك ... سێکی ئەو ڕۆژ گارەو بە گیان و هەستێکی نەتەوە پەروەر بیری کردۆتەوە . مستەفا شەوقی لە وتارێکی کە لە ژێر ناوی « وەتەن و میللەت » دا نووسیویەتی دەڵێ : « ... هەوێنی خۆشەویستی وەتەن و میللەت پەرستی تازە دانەهاتووە . لەناو ئەقوامی عالەمدا لە مێژینەوە هەروا بەم جۆرە ناسراوە .. » .

« بۆیە لە ئاکاوێکا هەموو میللەتی رابەری ئەمرۆ ، وا لە هەموو لایەکەوە سەربەخۆ ــ ن ــ بۆ پێشکەوتن و ئازادی میللەتی خۆیان خەریکن . ئێمە مانان کەوا ئەمرۆ لە ریزەی ئەقواما لە بازاری سیاسی عالەما هیوای ژیان و ئاواتخوازی پێشکەوتن و ئازادی میللەت ئەکەین ، جارێ لە پێش هەموو چشتێکا ئەبێ بزانین کە بناغەی ژیانی هەموو قەومێك بەپێی کۆششی خۆیەوە دائەمەزرێت . وەهیچ کارو کردکارێك لە خۆیەوە بەبێ بناغە سەرناگرێت و نا سازێت .. لەبەر ئەوە : بەوریایی و شێنەیی ووردبینەوە ! بۆ ئەوەی کە لەمەولا جارێکی تر بە تەفرە هەڵنەخەڵەتێین و بەرێی بێ فەڕو نشستیا رانەبووریین . چونکە ئینسان هەتا شارەزای ڕێی ڕزگاری نەبێت رزگاری بۆ نالوێت » . « با نەختێ سەر هەڵبڕین لە کاروکردەوەی ئەقوامی عالەم وورد ببینەوە با بزانین :لەچاو ئەوانا چیمان کەمە سەبەبی پاشکەوتنمان چیەو لە چیەوەیە ؟! یەکە یەکە بەدی بێنین و هەموو لایێك پێکەوە بی‌پشکنین و بیدۆزینەوە . بۆ ئەوەی کە وەکو ئەقوامی عالەم تێ‌بکۆشین . تاکو لە ریزەی ئەوانا روورەوامان ببێت و بتوانین هەقمان بە عالەمی مەدەنیەت بسەلمێنین »(٢٥) .

ـــ ئەمە نمونەیێکی بچکۆلانە بوو لەو نووسینانەی کە مستەفا شەوقی بۆمانی بەجێ‌هێشتووە . دەردەکەوێ ڕۆشنبیرێکی لێ‌هاتوو و نووسەرێکی سیاسی و ڕۆژنامە نووسێکی دلسۆزی نەتەوەو نیشتمانەکەی بووە .

مستەفا شەوقی بەر لەوەی بگەڕێتەوە بەغدا . دیارە لەوێ پەیوەندییێکی بەهێزی لەگەڵ ئەو کوردە نیشتمان پەروەرانە هەبووە کە لە ئەستەموول ژیاون، هەر لەوێیش فێری کاری ڕۆژنامە نووسی بووە ، چونکە ساڵی ١٩٢٦ کە ڕۆژنامەی بانگی کوردستان ـ ی مستەفا پاشا لە بەغدا دەرچووە ناوی مستەفا شەوقی لە لای ڕاستی لاپەڕەکە نووسراوە . کە نووسەری ڕۆژنامەکەیە واتە بە مانای ئەمڕۆکە سەرنووسەری بووە(٢٦) .

ـــ شێوەو قەبارەی ئەوسێ ژمارەیە گۆڕانی بەسەردا هاتووە ، لە لایەنێ هونەری و ڕێنووس و کوردی‌یەکەی باشتر بووە . چونکە لە ژمارە یەك تا ١٤ بە قەبارەی « ٣٤ سم × ٥ر٢١سم » و « تێکست ٥ر٢٨سم × ١٧سم » دەرچووە بەڵام ژمارە ــ ١٥ ، ١٦ . ١٧ ی بە چوار لاپەڕەی تێکستی « ٥٠سم × ٣٨سم » دەرچووە(٢٧) .

ـــ نموونەیێکی دیکەش کە لە سلێمانی دەرچووە لە ژێر ناوەکەیدا نووسراوە : « عیلمی . سیاسی . ئەدەبی ، غەزەتەیەکی میللی‌یە » کەچی ئەوسێ ژمارەیەی لە بەغدا دەرچووە لە ژێر ناوەکەیدا

نووسراوه « غەزەتەیێکی سیاسی ، ئەدەبی‌و فەنی یە » لێرە دا بۆمان دەردەکەوێ ، کە مستەفا شەوقی چەند ئاگاداری لەکاری ڕۆژنامە نووسی هەبووە . بۆیە وشەی « عیلمی » لابردووەو وشەی ـ فەنی ـ داناوە کە زیاتر پەیوەندی بە ڕۆژنامەکەوە هەبووە ·· تەنانەت تا ئێستاکەش ئێمە ڕۆژنامەو کۆڤاری زانستیمان نی‌یە(٢٨) ·

ـ مستەفا شەوقی ئەگەر لە ئەستەموول دا خۆی‌پێ نەگەیاندبێ فێری هونەری ڕۆژنامە نووسی نەبوو بێ ، چۆن دەیتوانی یەکسەر کاروباری ڕۆژنامەی بانگی کوردستان ڕاپەڕێنی‌و سەرنووسەری بێ . ئەو کاتەی کە لە بەغدادەرچووە ·· بەلکو وا دەردەکەوێ دەورێکی سەرەکی‌ی لە دەرکردن‌و پێش‌خستنی گێڕاوە ·

ـ لە ڕووی ڕێنوسیشەوە نمونەیەك دێنمەوە، ئەویش ئەوەیە ئەو کاتەی « بانگی کوردستان » لە سلێمانی دەرچووە ، وشەی «کوردستان» بەرێنووسی عارەبی نووسراوە واتە « کردستان » کەچی کەلە بەغدا دەرچووە ڕاستی‌یەکەی نووسراوە واتا « کوردستان »(٢٩) ئەوسێ ژمارەیەی « بانگی کورستان » کە گوتمان لە بەغدا دەرچووە چوار چیوەی بابەتو دەنگو باسی فراوانترو بە هێزترن ، بۆ نموونە ژمارەیێکی زۆر دەنگو باسی وڵاتانی جیهانی تێدایە کە لە (١٤) ژمارەکەی سلێمانیدا بەدی ناکرێ ئەمەش دوو هۆی هەیە :

یەکەمیان : دەرچوونی لە بەغدا کە پایتەخت بووە ، دووەم ڕەنگ دانەوەی دەوروو چۆنێتی بیرکردنەوەی مستەفا شەوقی‌یە · هەروەها دەبینین وتارێك لە ژێر ناوێ « سەیری دونیا کەن لە ژمارە ١٤ــ١ دا ، یان سەر وتاری دووەم ژمارەی بەغدا١٤ـ٢ بەم ناونیشانە نووسیویەتی : « جەوابی ئەوانە کە بە خۆڕایی باسی کوردایەتی دەکەن»! بلاوکراوەتەوە· هەر دوو وتارەکە سیاسی‌و چاکن ·· ناوی کەسیشی پێوە نی‌یە . زۆر لە وەدەچێ مستەفا شەوقی نووسیبێتی · چونکە سەرنووسەری ڕۆژنامەکە بووە(٣) ···

## ● ڕۆژنامە نووسێکی کۆڵنەدەر

دەرکردنی گۆڤاری پەیژە، بەم شێوەیە · واتا کۆکردنەوەی چەند بابەت‌و شیعر وەرگرتنی بڕیاری لە ڕەقابە ـ واتا ئیمتیازی نەبووە وەك گۆڤارێکی ئاسایی ـ ئەوە دەگەیێنی . ئەو کاتە لە بەغدا هیچ ڕۆژنامەو گۆڤارێك دەر نەچووە ·· هەروەاش بووە ، چونکە دووا ژمارەی گۆڤاری دیاری کوردستان لە (١٠)ی مایسی ١٩٢٦ دەرچووە(٣١) · بڕیاری چاپ کردنی «پەیژەش» لە لایەن ڕەقابەوە لە ٢٩ـ١١ـ٩٢٦ دەرچووە(٣٢) کەواتە گۆڤاری پەیژە نیشانەی ئەوەیە ، کە مستەفا شەوقی ویستوویەتی بە هەر جۆرێك بوو بێ · وشەی ڕەسەنی کوردی لە ڕێگای ڕۆژنامە نووسی‌و چاپەمەنی پەرە بسێنێ‌و گەشە بکات ·· سەدان ڕۆڵەی کورد لە خەوی غەفلەتی ڕاپەڕێنێ ·· جا بە پێی ئەو پێشەکی‌یەی کە بۆ گۆڤاری پەیژە نووسیویەتی · زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە کە ڕۆژنامە نووسێکی کۆڵنەدەرو خەم‌خۆری زمانە زگماکەکەی بووە . بەلکو هەردەم لە دەرفەت‌گەڕاوە بۆ ئەوەی وشەی پاك‌و خاوێنی کوردی بلاوبێتەوەو زیاتر کۆمەلانی خەلك هۆشیار بکاتەوە بۆ ئەوەی ڕۆژێك زووتر لە نەگبەتی دواکەوتن‌و زولم‌و زۆرداری نەتەوەیی‌و سیاسی ڕزگاریان ببێ ·· مستەفا شەوقی لەو پێشەکی یەدا دەڵێ : « تاکو ڕۆژنامەیەکمان بۆ ڕایی‌نەبێت ، جارێ هەر بۆ ئەوەی کە نووسینمان بلاوبێتەوە بە هیوای یارمەتی تێگەشتوانی میللەتەوە ناو بەناو . بەم جۆرە خزمەتی میللەتم گرتووەتە بەر هیچ نەبێت لە ناو یارو ئەغیارا(٣٣) نووسینمان بلاو بێتەوە · کە ئەوەیش ئەمڕۆ بۆ ئێمە گەلێ کەلێ پێویستە » ·

« بە تایبەتی تکا لە تێگەیشتوانی میللەت ئەکەم · لە لایەنی ناتەواوی شیوەی نووسینەوە لێم ببورن ! بیست‌و هەشت ساڵ لەوەپێش هەشت ساڵان بووم کە لە کوردستان دورکەوتوتەوە · تا ئێستا هەر بە زمانی فارسی وعەرەبی‌و تورکی لە خوێندن‌و نووسینا ڕاهاتووم ·· بە زمانی خۆ بەبێ هاودەنگ ئەمڕۆ هەر ئەوەندە ئەتوانم بنووسم » · « لەبەر ئەوە هیوام گەورەیە لێم ناگرن لێم ئەبوورن » ·

بەغدا : ٢٣ـ٥ـ١٩٢٧ ئیمزا مستەفا شەوقی(٣٤)

ئەو چەند نموونەیەی لە نووسینەکانی مستەفا شەوقی کە هێنامنەوەو بەر لە ٥٣ ساڵ زیاتر نووسراونەتەوە · زۆر بە توندی ڕاو دەست نیشان کردنەکەمان دەسەلمێنن . کە ئەم زاتە مرۆڤێکی دلسۆزو هوشیار بووە . ڕۆشنبیرێکی نەتەوە ـ پەروەر و ڕۆژنامە نوسێکی کۆڵنەدەری کەم وێنەی

سەردەمی خۆی بووە ·

* *

ـــ ئێستا کەش بـــە گشتی باسی گۆڤاری « پەیژە » دەکەم ، چـونکە لە پێشەوە گوتم هــــەر دووکیانم بەیەکەوە بەستۆتەوە ، واتە مستەفا شەوقیو پەیژە یان پەیژەو مستەفا شەوقی ·

ـــ ئەم گۆڤارە جگە لە پێشەکی‌یەکەی هەشت جۆرە نووسینو شیعری تێدا یە ، چلو چوار لاپەرەی داگرتووە ، لەم هەشـــت ماددەیە ، چواری مستەفا شەوقی نووسیویەتی . ئەوانی دیکـەش دووانی هی ( سەید عەبدول خالیق کەرکوکی یە ) « ئەسیری » شیعرێکی م نوری ـ شیخ نوری شیخ سالح ـ لەگەڵ شیعرێکی قازی هەڵەبجە مەلاحەسەن(٣٥) ·

ـــ بەڵام دکتور کەمال مەزهەر دەڵێ :«ناوەرۆکی بریتی‌یە لە ژمارە یەکو وتارو شیعر کـە لەوە دەچێ هەمووی مستەفا شەوقی خۆی نووسیبێتی »(٣٦) ·

ـــ ئـــەوەی یەکسەر ســــەرنجی خوێندەوار رادەکێشی ئەوەیە لە ژێر ناوەکەیدا نووســــراوە : « ئەدەبی ، ئیجتماعی یە بە کـــوردی بۆ کوردایەتی ئەدوێ » لێرە دا مەبەست لە وشەی « بە کوردی بۆ کوردایەتی ئەدوێ » یـــە ·· دیارە خاوەنەکـــەی

سووربونەکەی نیشان دەدات کـە بەرهەمەکەی بـــە زمانی زگماکی یەتی . هەروەها نیشانەیێکی زیلدووی بوونی نەتەوەیە . لە رۆژگارێکا ئـــەو زمانە ـ واتا زمانی کوردی ـ نەك تەنیـــا لە رێگای چاپەمەنیو رۆژنامە نووسی یەوە مافی رەوای خۆی لێ‌ســـەندرا بوو . بگرە لە لایەن داMو دەزگاکانی میری ئەوســـا بەربەرەکانی‌یەکی توندیشی کراوە ··

لەوە گرنگتریش ئەوەیە وشەی « کوردایەتی » ئەوسا لە رێگای چاپەمەنی زۆر کەم بەکار هاتووە . هەرچەنـــد تا رادەیێك کۆمــــەڵانی خەڵك وشـــەی « کورداتی » یان بەکار هێناوە بەڵام زیاتر لە رووی کۆمەڵایەتی یەوە بووە ، نەك سیاسی‌ی بە چـــەمکی رۆژگاری ئەمرۆ کەمانـــدا ·· لە کاتێکا ئەوەی پاش سی‌یەکان تا ئێستاکەش لایـــەنی سیاسی یەکـــەی کوردایەتی لە رێگای جوولانەوەی نەتەوە خوازی‌یەوە بە ئێمـــە گەیشتووەو مەغزایێکی پیرۆزی هـــەیە ·· بەڵام مستەفا شـــەوقی دیارە بـــە نیازی مەبەستو ئامانجێکی پیرۆز ئەم وشەیەی خستۆتە ســـەر بەرگی گۆڤارەکەی · ئـــەوەش وەك درۆشمێکی نەتەوەیی‌و سیاسی بە کۆمەڵانی خەڵکی راگەیاندووە بۆ ئەوەی لە پێناویدا تێ‌بکۆشن وئامانجەکانی وەدەست بێنن ·

بە کورتی ئەم دوو وشـــەیە : « بە کوردی بۆ کوردایەتی ئەدوێ » ئەوە دووپات دەکاتەوە ، کـــە خاوەنەکەی نیشتمان پەروەرێکی راستەقینەی رێگای سەرفرازی نەتەوەی کوردی چەوساوە بووە ·

## ● بۆ ناوی ناوە « پەیژە » ؟

بەلای منەوە ئەوانەت کە ناوی گۆڤارەکەی ناوە « پەیژە » دیسان بە مەبەستێکی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی بووە ، کە لە رێگای چاپەمەنی‌و رۆژنامە نووسی یەوە پەیتا پەیتا بەربەرەکانی دواکـەوتی‌و نەخوێندەواری دەکرێ وکۆمەڵانی خەڵك هوشیار دەبنەوەو دەســـت نیشانی ئێش‌و ئازاریان دەکەن‌و بیر لە چارەســـەری دەکەنەوە ·

## ● رێبازی نیشتمانی‌و نەتەوەیی گۆڤارەکە

بەگشتی ئـــەو ژمارەوتارو شـــیعرانەی تێیدا بڵاوکراوەتەوە نیشتمانی‌و نـــەتەوەیین ، بـــەگیانو هەستێکی کورد پەروەری‌و لەبەر رۆشنایی رێبـــازو ئامانجێکی سیاسی شۆرشگێرانە دا نووســـراون . بگرە رەنگ دانەوەی باری شەپرزەیی‌و چەوساندنەوەی نەتەوەیی‌و دواکەوتنی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و فروفێڵ بێگانەکانو فەرمانرەواکانی ئەوسای رژێمی پاشایەتی دەنوێنن ··

جگە لە دەست‌نیشان کردنی هۆیەکانی پارچـە پارچە بوونی نیشتمانو یەك نەبوونو یەك نەگرتنی کورد لە ناو خۆی دا ·· هەروەها بە ئاشکرا پەنجە بۆ مەسەلەی دووبەرەکی‌و ناکۆکی وملکەچی هەندێ لە کوردەکانی ئەوسەردەمە درێژ دەکات ·· بـــەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم دەردو هۆیە کوشندانە دەخاتە روو · رۆڵەکانی نەتەوەی کورد هان دەدات کە زیاتر بازووی تێکۆشان وەکار بخەن ···

بۆ سەلماندنو دووپات کردنەوەیی ئەم دەست‌نیشان کردنـــە بە گشتی لە ناوەرۆکی گۆڤارەکە چـــەند تێکستێك « دەق » دێنمەوە ولەسەری دەدوێم ·

لە وتاری وەتەن‌و میللەت دا کە مستەفا شـــەوقی نووسیویەتی لە دووەم بەشی دا دەڵێ : « قەد ناشی تا ئێستا تێ‌نەگەیشتبین کە بۆ ژیانی ئازادی میللەت سەرەتای گشت کارێك لە ناو خـــۆمانا یەك بوونی ـ یە ·· خوا نەخواستە ، ناکۆکی‌و دوودڵی‌و هاژاوە نفلانەی سەرگەردانی‌و ئەنجامی پەریشانی یە · بـــە

تایبەتی لەم زەمانە دا : ئەگەر بێتو قەومێك لە ڕێزەی ئەقواما پاشکەوێتو بە پێی ئەوان وەکو ئەوان هەوڵو تەقەللا نەدات . دەست لە خۆی بشوات کەس یەکی بەبەر ناکەوێت ، کەس بەزەیی پێ نایەت . لە ژێر دەستو پێدا ئەمینێت ، الە پڕێکا ناونیشانی ون ئەبێت بە جارێك ئەفەوتێو ئەمرێت . لە دنیادا ئەم هەموو ئەقوامەی کە هاتوون وچوون بوونو ئەماون گشتیان بە هۆی ئاگاداری یەکێتیی خۆیان خۆیانەوە ژیاون . کە بەتەنگ خۆیانەوە نەبوونو لە حەق لایان داوە سەرەو ژێربوونو فەوتاوون ! قەومێك کە بێباكو بێ پەروا بێتو بەتەنگ خۆیەوە نەبێت ماڵو مۆڵکی ئەو قەومە هەروەکو قومارخانەی بەسەریەت ئەبێ بە یاری بەدەست چەند کەسێکەوە، ئەوکەسانە لە ناو خۆیانا بەنۆرە هەر ڕۆژ یەکێکیان ئەیباتەوەو دوواییان ئەیدۆڕێنن . بە پاشا بەرەبەرە

یەك لە دوای یەك گشتیان بە جارێك ئەیدۆڕێنن مولکو میللەتیش لەگەڵ خۆیان ئەفەوتێنن »(٣٧) .

ئەم قسەو بۆچونانە بەر لە ٥٣ساڵ گوتراون کە چەند بە ووردی باری ناهەمواری کۆمەڵی کوردەواری دەست نیشان کردووەو چۆن دلسۆزانە هانی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد دەدات . کە مەسەلەی هۆشیاری ویەکێتیی بەردی بناغەی سەرکەوتنە . هەروەها خاوەنەکەی لە ناخی یەوە هاوار دەکات بۆ ئەوەی بە زوویی چارەسەری مەسەلەکە بکرێ .

ــ یان دەبینین خاوەنی هەمان وتار وەك تێکۆشەرێکی ڕۆشنبیرو شۆڕش شکێر چۆن مەسەلەی زانستو پیشەسازی بە هۆیێکی گرنگی سەرکەوتنی نیشتمانیو نەتەوەیی دەزانی . مستەفا شەوقی لە بەشی سێیەمی وتارەکەی دا دەڵێ :ــ « لەم زەمانە دا کەوا هەموو قەومێك خۆبەخۆ لە پێناوی چاکەی کەلكو کاری خۆیانا شەوو ڕۆژ بە دڵو بەگیان حەریکن .. ئێمە مانان ئەگەر بە خۆمان بزانین لە چاو کۆششی ئەوانا بێ دەنگو بێ سروە بە پیر مردنەوە ئەچین ! قەومێك کە لە علمو لە سەنعەت ێ بەهرە بێت بە هیچ ئاواتێك ناگات . وەکو درەختێکی بێبەرو بێ گەڵا . واتا سێبەریشی بۆ نابێت کە ئینسان لە بەری بحەسێتەوە »

« ئێمە مانان لە چاو ئەقوامی عالەمدا سەبەبی پاشکەوتنمان لە پیش هەموو چشتێکدا لە کردەوەی خۆمان ئەیدۆزینەوە . تۆزێ لە تەئریخی عالەم ورد بینەوە ئەوسا لە خۆمان ئەگەینو ئەزانین کە سەبەبی پاشکەوتنمان دور بەشی لەشی لەبەر بێباکیو بێ پەروایی خۆمانەوە رووی داوە » .

« هەفتا ساڵ لەمەوپێش لەو ڕۆژەوە کە بناغەی سەربەخۆی کوردستانی خۆمان تێکچووە . لە ناوبراو تا ڕۆژایەکی ئەمڕۆ لە هیچ لایەکەوە توخنی کاری خۆمان نەکەوتووین . لە خۆمانەوە بۆ خۆمان هیچمان نەکردووە . هەر چیەکمان کردبێت بۆ بێگانە بوورەو هەر بە کەڵکی کاری ئەوان هاتووە » .

« هیچ قەومێك بە جەستەی ئێمە نە بووە . کەس وەکو ئێمەی لێ نەهاتووە ! لە ناو خۆمانا بەیەکتری یەوە ئەنووساوین هەچ کەس لە عاستێکەوە بۆ خۆی لەگەڵ خۆی خەریك ماوە . خزمەتی بێگانە بەدڵو بەگیانو بە خۆشی . خزمەتی خۆ بە بێگاریو سووکی ئاسراوە . لەبەر ئەوە . بۆ چاکەی میللەت هیچمان پێ نەکراوەو هەر چیەکمان بووە بە فێلو هەڵەتی بێگانە کوپچر کوپچر لەناو براوە »(٣٨) .

## ● پەیڤو ووتاری سیاسی

گوتمان بە گشتی ناوەڕۆکی گۆڤارەکە نیشتمانیو نەتەوەیی وباسەکانی لە مەسەلەی چەوساندنەوەی نیشتمانیو نەتەوەیی دە دوێن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە هەڵدەگرێ بەشێکیش لەم باسە دا لە ژێر ئەم ناوەدا لێیبدوێین ، چونکە ڕاستی گۆڤارەکە چەند مەسەلەیەکی دیکەی زۆر گرنگو ڕاستەوخۆ خستۆتە بەرچاو . لەوانە . بەڵێنی بێگانەکانو ئەنجامی بڕواکردن بە بێگانە . چ زیانێکی گەورە بەچارە نووسی گەلان دەبەخشێ . هەروەها مەسەلەی گرنگی دورستبوونی ڕێکخراوی ڕۆشنبیریو کۆمەلایەتیو سیاسی چ دەورێکی گەورەی هەیە لە هوشیار کردنەوەی کۆمەلانی خەلك دا لە پێناوی وەدەستهێنانی مافە مرۆڤ پەروەریو نەتەوەیی یەکان .

ــ لە ووتارێکدا کە لە ژێر ناوی « گفتوگۆ » کە بە شێوەی پرسیارو وەڵام لە نێوان « بارامو ڕۆستەم » دا بلاوکراوەتەوە گفتوگۆیەکی زەوانو سیاسیو ڕۆشنبیری یە .. پێشەکی بە پەندی پێشینان دەچێتە ناوباسەکەوە ، ئەم پەنا بردنە بەر پەندی پێشینانە هەڵویستو هەستی خاوەنەکەی

ـممر کەلەپووری نەتـەوەیی دەنوێنێ پاش ئەوەی ـە ڕێگای پەنـدی کـــوردیەوە مەبەستی خۆی روون ـەکاتەوە ، دەر بارەی مەسەلەیەکی زۆر گرنگ دەدوێ، ئەویش ئەوەیە کە پێویستە نەتەوە پشت بە خـۆی ببەستێو سوود لە هەوڵو کۆششی باوکو باپیرانی وەرگرێ پاش ئـەم دەستپێکردنە باسی مەبەستە سیاسیەکەی ئاشکرادەکاو دەڵی :ـ

بارام « بۆ پێشکەوتنو بەرزبوونەوەی میللەت ـەناو خۆمانا لە هـــەموو لایەکەوە جاری جەمعیاتیو عمیەوجەمعیاتی خەیریمــان پێویستە » رۆستەم : لە پێویستی ئـــەم جەمعیەتانە میللەت دەمێکە لە

رووەوە تێگەیشتووە · ئەم جۆرە کارانە راستەوخۆ بە کۆششی تێگەیشتوانی میللەت دائەمزرێت خـوا وا بکا تێگەیشتوانی میللەت بۆ ئەم کارە خێرە کـە بناغەی ژیانی میللەتە تێبکۆشنو سازی بفەرموون » ·

بارام « بەڵێنی « ویلسون » بەباچوو کەچی ئەم دەنگە هەروا لەگوێمانا ئەزرنگێنێ »(٣٩) ·

رۆستەم « بۆ ئەوەی ئاواتی خۆیان بەجێ بێنن مەوێنێکی زۆر باشیان داتا سەردەمێکی دوورو درێژ بەتاسەوە چاوەڕوانی ئەو بەڵێنە یان کردین کاتێك بە خۆمان زانی کەوا بەم رۆژە گەیشتین · پاش ئـەوەی هەڵوێستو بەڵێنەکەی ویلسون ئاشکرا دەکار ئەمجا بڕیارەکەی کۆمەڵی نەتەوەکان دەرهەق کورد دەخاتە روو هـــەروەها مەســـەلەی کۆششی خـۆی دووپات دەکاتەوەو لەناخیەوە بۆ مەسەلە سەرەکیەکەی خاکو نەتەوە وەك مۆمێك دەسووتێو دەچرێکێنێ :ـ

بارام ·· « ئەی جەمعیەتی ئەقوام چی لێ هات؟ خۆ هیوای گەورەمان هەر بە بەڵێنی ئەوانە » ·

رۆستەم :ـ « جەمعیەتی ئەقـــوام بۆ میللەتی کوردو بەتایبەتی بۆ ئێمە کە بەکوردستانی جنوبی ناسراوین قراری خۆی داوە . ئەو قەرارە کە بۆئێمـــە بوو . لە دووەمین ژمارەی رۆژنامەی بانگی کوردستانا هەندێکی نووسراوە · بە پێی ئەم قـەرارە لە ریزەی ئەقواما هەقمان ئاگاداری کراوە . بە کۆششی خۆمان گشـــت ئاواتێکمـــان بۆ رایی ئەبێت بەبێ کۆشش هیچمان پێ ناکرێت »(٤٠) ·

خاوەنی وتارە کە هەرچەند باسی بڕیارەکـەی کۆمـــەڵی نەتەوەکان دەکات و هیوایەکی گـەورەی پێی هـــەیەو دڵخۆشی خـــۆی دەردەبڕێ · چونکە هۆیێکی گەورە بووە دەربارەی چارەنووسی نەتەوەی

کـــورد ، بەڵام لەگـــەڵ ئەوەشـــدا دیسان ئاواتە پیرۆزەکـــەی بە کۆششی خۆیو کۆمـــەڵانی خەڵکی کوردستان دەبەستێتەوە · بەڵکو زۆر جاریش دوو پاتی دەکاتەوە ··

* *

## ● مەسەلەی بیری پێشکەوتن خوازانەو خوێندن بە کوردی لە گۆڤارەکەدا

ـــ دەوری مەسەلەی بیری پێشکەوتن خوازانەو دەوری گـرنگی خـوێندن بە کـــوردی لە کـۆمەڵی کوردەواری ڕێبازێکی پیرۆزی گۆڤارەکە بووە ، بگرە نیشانەیێکی بە هێزی رۆشنبیریەو هەستی نەتەوە پەروەری خاوەنەکەیەتی ·

مستەفا شـەوقی بەر لە (٥٣) ساڵ داوا دەکات کتێبەکانی کوردی بە گیانو هەستێکی کـوردایەتی دابنرێنو لەگەڵ مێژوو وئاواتی دوا رۆژی کـــورد بگونجێ ·· داوای خانەیێکی مامۆستایان بە کوردی دەکات ·· هەروەها دەرکەوتنو بڵاوبوونەوەی بیری پێشکەوتنخوازانە بە چراییکی رۆشنی ژیاندەزانێ·· بەڵکو زیاتر لە چراش · وەك بروسك کە ئاسمانو رێسمان رووناك دەکاتـــەوە ·· لە لایـــەکی دیکەش ســـــەرچاوەی ژانو ئێشو ئازاری کوردەواری بە نەزانینو نەخوێندەواری بەستۆتەوە ·

مرۆڤ کە ناوەرۆکی ئەم وتارە دەور دەکاتەوە، هـــەستی نەتەوە پەروەری هـــەموو گیانی دەتەزێنێ · بۆ بەر لە ـ ٥٣ ـ ساڵ دەگەڕێتەوەو وێنەی ئـــەم سوارچاکەی مـــەیدانی کـــوردایەتی دێتــە بـــەرچاوو پەیکەری ئەمری، لە داربەرووی شاخەکانی کوردستان بۆ دەتاشێ ئەزموون دووبارە بەشێتێکی دیکەی وتاری کە لە ژێر ناوی « گفتوگۆ » دا بچینەوە ·

« رۆستەم به تایبـــەتی لەم زەمانەدا کـــە هەموو قەومێك بۆخۆیو لەگـــەڵ خـــۆی خـــەریکە ·· فیکری پێشکەوتنخـوازی لەناو قەومێکدا لە هـــەموو لایەکەوە کە دەرکەوت وەکو چـــرا ، واتا تریشقەی لێرە مەبەستی بروسکەی ـ م·ح ـ رووناکـی بـــە هەموو لایەکا بڵاوئەکاتەوە » ·

« (١) هەموو عراقی یەك لە وتنی ڕای خـۆیو بڵاوکردنـــەوەی بـــە نووسینو لەمەجلیس گـرتن ـ تەئلیفی جەمعیات ـ بەپێی قانوون سەربەستە » ·

پار ساڵ لە بەغدا جەمعیـــە تێك ، کۆمەڵێك دامەزرا بووبۆ نووسینی کتێب کـــە لە قوتابخانەکانی

کوردستانا بخوێنرێت ئـەو کۆمەڵە چی لێ هات ؟ مەکتەب بەبێ کتێب چ کـەڵکێ ئەگرێت ئیمە مانان ئەمرۆ لە پێش گشت کارێکا پێرەوێکی مەعاریفمان پێویستە کە لە کوردایەتی بوومشێتەوە ٠

لـەوەو لاوە بۆ رێکخستنی نووسینو کتێب کۆمەڵێك ـ مەبەستی کۆمەڵە کتێبە کە ـ م٠ح ـ بۆ

ژیانی فونابیو قوتابخانە هیچ نەبێت لەلایەنی کەمەوە بۆ ئەمرۆ دارالمعلمێکی کوردیمان گەرەکە » ٠

« رۆستەم : لام وایـە ناررراوەکانمان کـە نماینـدەی میللەتن لە لایـەنی قوتابخانـەکانی کوردستانەوە پێر ساڵ لە مەجلیسا هەندێ گفتوگۆیان کردبوو بەڵام دوای نەهات بزانین ئەم ساڵ چیبەجی نەکەن » ٠

« بارام : تائێستا بە هۆی نەزانکاری خۆمانەوە زۆرمان چەشتو گەلێکمان نۆشی » ٠

ــ ئەم وتارە ـ ١٤ ـ لاپەرەیە ، زۆر چەمکو بیروباوەری نەتەوەییو سیاسیو رۆشنبیری دیکـەی بە نرخی تێدایە بەڵام ئێمـە بەوەنـدە وازدێنین ، چونکەو ابزانم کاکڵی وتارەکەمان بەشیکردنەوەیەکی کـورتو خەسـت خستە بـەرچاو لە دەرفەتێکی بە فراوانی لێی دەدوێین ٠٠

* *

## ● لایەنی ئەدەبیی گۆڤارەکە

هەروەکو پێشەوە گوتمان . جگە لە پێشەکیەکەی هەشت نووسینی تیدا بڵاوکراوەتەوە . لەوانە چواری شیعرە لەگـەڵ (٢٦) پـەنـدی کوردی ٠ چـوار شیعرەکەش لە شیعرە چاکەکانی ئەو سەردەمەن هەر چواری نەتەوەییو سیاسییە جگە لەوەی رەنگدانەوەی موعاناتی کۆمـەڵانی خـەڵکی کوردستانو خوودی شاعرەکانە ، لە هـەمان کاتیشدا بڕوایـەکی زۆر بەهێزیان بە دوا رۆژو سەرکەوتنی نەتەوە هەیە ، بە تایبەتی شیعرە بەناو بانگەکەی « نەسیری » سـەید عەبدول خالیقی کەرکووکی لـە ژێر ناوی «وەسیەت» دا هـەروەها بڵاوکردنەوەی ـ ٢٦ ـ پەندی پێشینان ئەوەهۆو رەگەزێکی دیکەیە بۆ پتەو کـردنی گۆڤارە کە . جگە لەوەی تۆمارکردنی فۆلکلۆری کوردی بـە هەموو لقەکانییەوە . خزمـەتێکی گەورەی ئەدەبو زمانو مێژووی کـوردە ٠٠ بڵاوکـردنەوەی ئـەو پەندانەش نیشانەو هەڵوێستی گۆڤارەکـەیە لەبەر

نرخزانینی فۆلکلـۆری کـوردییەکە سـەرچاوەی ئەدەبیاتی سەردەمی ئەوانو ئەمرۆکەمانە . لە هەمان کاتیشـدا بڵاوبوونەوەی مـەغزاێکی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتی هەیە ٠

* *

مەلا حەسەنی قاری هەڵەبجەش . شیعرێکی لە ژێر ناوی « گلەیی » دا بڵاو کـردۆتەوە . راستی شیعرەکـەی مـەلا حەسەن ٠ شیعرێکی نەتەوییو سیاسی بـەهێزە ٠ وەك وتاری سیاسی بە فراوانی باسی باری ناهەموارو چەوساندنەوەی نەتەوەی کورد دەکـات پەنجە بۆ ئێشو ئازارەکانی درێژ دەکات . بەراوردێکی ورد ٠ لە نێوان باری نەتەوەی کـوردو نەتەوەکانی دیکەی ئەوسا ئەکا کە یەکێتیو سەربەخۆی یان وەدەست هێناوە ٠٠ شیعرەکە بریتییە لە شەست دێر ، کە دوازدە کۆپلەی پێنج خشتەکییە بۆ نموونە کۆپلەیەکی دێنینەوە :

ئـەم دەنگە هـەموو ناڵەی کوردانە لە دەست غەیر
ئەم شۆرە سەدای شێوەنی کوردانە لە دەست غەیر
ئەم نرکە هەموو سۆزشی کوردانە لە دەست غەیر
ئەم خۆینە گەشە خوێنی شەهیدانە لە دەست غەیر
ئەم نەعرە هەموو نەعرەی کـوردانە لە سـەر دار

* *

شیعرەکەی م ٠ نوری ـ شیخ نوری شیخ سالح ـ م٠ح ـ کە لە ژێر ناوی « هاواری وەتەن » ە هەر لە بابەتی دوو شیعرەکەی دیکەیەکە باسمان کردن ٠٠ وەسیەتەکەی نەسیریش پێویسـت بـەوە ناکات ، ئەوەندە لە سەری بدوێم ، چونکە شیعرەکە بەهێزەو بەخشەی ئاواتێکی پیرۆزی نەتەوەیی دەست نیشـان دەکات ٠

* *

## ● لایەنی زمانەوانیی گۆڤارەکە

بـە گشتی لایەنی زمانـەوانیو رێنووسەکەی خراپ نیە بەڵکو بە گوێرەی ئەو سەردەمە چاکـە بە تایبەتی ئەگـەر دەوری خاوەنەکەی بە هۆێکی سەرەکی بژمێرین ٠٠ چونکە مستەفا شەوقی هـەر وەکوو خـۆی دەڵێ « لەلایەنی ناتەواوی شێوەی نووسینەوە لێم ببورن ! بیستو هەشت ساڵ لەمەوە پێش هەشـت سـاڵان بووم کـە لە کوردستان دوورکەوتوومەوە ٠ تا ئێستا هەر بە زمانی فارسیو عـەرەبیو تورکی لەخوێندنو نووسینا ڕاهاتووم ٠٠

بە زمانی حۆ ـ واتا بەپێی ئەوەندەی دەزانی م.ج ـ بەبێ هاودەنگ ئەمرۆ هەرئەوەندە ئەتوانم بنووسم .

ـــ «لەبەر ئەوە هیوام گەورەیە لێم ناگرن ، لێم نەبوورن» (٤١) .

بۆچی لەمەر زمانەوانیو ڕێنووسەکەی باسی مستەفا شەوقی دەکەم ..؟ چونکە هەروەکو لە پێشەوە گوتمان پێشەکی‌یەکەو چوار وتاری ئەو نووسیوویەتی ئەوانی دیکە پەندی کوردیو شیعرن.. کەواتا بارستایی کوردی‌یەکە ی بەگشتی بۆ مستەفا شەوقی دەگەڕێتەوە .. بەلام لایەنی زمانەوانی‌ی شیعرەکان ئەوە خوودی شاعیرەکان دەگرێتەوە . ئەوانیش بەش‌بەحالی خۆیان باشن .

ـــ بە کورتی گۆڤارەکە لەم ڕووەوە هەمووی باشە هەروەکو دکتور کەمال مەزهەر دەڵێ : « کوردی‌یەکەی ڕێکو پێکو ڕەوانە »(٤٢) .

ـــ ئەوەی ڕاستی بێ بە گشتی زمانی گۆڤارەکە سادەو ڕەوانە . بە گوێرەی ئەو ڕۆژگارە باش بووە . لە گێژاوی سەرشێوانی ئەم وئەو دوور بووە .

* *

## ● ئەنجامێکی گشتی

گۆڤاری پەیژە . هەروەکو ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیانەی بەر لە خۆی نیشانەی سەرهەڵدانو دروست بوونی جووڵانەوەو ڕێکخراوە ڕۆشنبیری‌و نەتەوەی‌یەکانە تەنانەت سیاسیش ، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دروست بوو بوون .. بە واتایەکی تر لە ژێر کاری بزوتنەوەی ڕووناکبیری‌ی سەدەی نۆزدەهەم کەڵاڵە بووە ، کە لە ڕێگای ئازادیخوازانی بەتەوە ژێر دەستەکانی دەوڵەتی عوسمانی بە کوردەکانی ئەستەموول گەیشتووە .

کوردەکانیش پێشەکی ، ڕەگەزو سەرەتای ئەوجووڵانەوەو ڕووناکبیری‌یە بەبەرهەمی ئەدەبیان دەست‌پێ‌کردووە . وەك حاجی قادری کۆیی‌و دەیان شاعیری دیکەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەم . لە لایەنی ڕۆژنامەو ڕۆژنامە نووسی‌شەوە لەگەڵ ڕۆژنامەی کوردستان ـ ی میقداد مەدحەت بەدرخان دەستی پێ کردووە هەروەها ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیانە کە بە دوای ڕۆژنامەی کوردستاندا هاتن وەك « ڕۆژنامەی کورد ئەستەموول ١٩٠٧ . کورد تەعاون وەتەرەقی‌غەزەتەسی ئەستەموول پاش ١٩٠٨ . ڕۆژی‌کورد ئەستەموول ١٩١٣ . گۆڤاری ژین ـ ی سورەیا بەدرخان ـ ١٩١٦ ڕۆژی‌کوردستان ـ ی میهری ـ ١٩١٧ـ١٩١٨ . «ژین» ی مەمدوح سەلیم وکەمال فەوزی . پێشکەوتنی مستەفا پاشا ٩٢٠ـ٩٢٣ . ڕۆژی کوردستانی شیخ نوری شیخ سالح ٩٢٢ـ٩٢٣ ، ڕۆژنامەی بانگی کوردستان ـ ی مستەفا پاشا ٩٢٢ـ٩٢٦ . دیاری کوردستان ـ ی سالح زەکی ساحیبقران ٩٢٥ـ٩٢٦ ( پەیژە ) ی مستەفا شەوقی ١٩٢٧ ... هتد »(٤٣) .

ـــ بە کورتی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیانە لە هەر شوێنێ دەرچووبن . بەردە پتەوەکەی بناغەی مێژووی ڕۆژنامەنووسیان داناوە . واتا گۆڤاری پەیژەش ئەستێرەیێکی گەشی ئەو ڕەوتە پیرۆزەو ڕەنگ‌دانەوەی هەستو ئاستی ڕۆشنبیری‌و هەڵوێستی نەتەوەیی‌و سیاسی ئەوکۆمەڵە ڕۆشنبیرە کوردانەیە کە بزووتنەوەی ڕووناکبیری سەدەی نۆزدەهەم کاری تێ کردوون .

ـــ تێکرا گۆڤارەکەو ناوەرۆکی نموونەو نیشانەیێکی زیندووی گیانو هەستی کورد پەروەری‌و خەباتی دڵسۆزانەی خاوەن وتارو شیعرەکانن کە هەموویان ڕێگا بۆ پێشکەوتنی زمانو ئەدەبی کوردی‌و بڵاوبوونەوەی هەستی کوردایەتی‌و وەدەست هێنانی دوا ڕۆژێکی کامەرانو سەرزفرازی نەتەوەیی خۆش کردووە .

لە لایەکی دیکەوە ئەم باسە ئەوەی سەلماند کە مستەفا شەوقی خەڵکی کوردستانی عیراق بووە وبە تایبەتی خەڵکی سلێمانی .. جا ساغ‌کردنەوەی ئەم حاڵەش لە بەرئەوەی گرنگی تایبەتی‌خۆی هەیە ، چونکە و.مارف خەزنەدار بەهەڵە تۆماری کردووە ... هەروەها زانیاری دەربارەی کەمە ..

## ● سەرنجێکی بچکۆلانە

لە وانەیە هەندێ کەس بڵێ . ئەم باسە کرچو کاڵە ناتەواوی پێوە دیارە ..! دەڵێم بە گشتی لە وانەیە وابێ .. بەڵام بەلای منەوە گرنگترین خاڵ ئەوە بوو لاپەڕەیێکی شاراوەی مێژووی ڕۆژنامە نووسی کوردی‌و دڵسۆزێکی وشەی ڕەسەنی کوردی، ڕۆژنامە نووسێکی کۆڵنەدەر بخەمە بەر چاو .. تا خەڵکی دیکە زیاتر لێی بکۆڵنەوەو .. لە لایەکی ترەوەش چاپ کردنی ئەم باسەو خوودی گۆڤارەکە

بە سەریەکەوە لەگەڵ ماددەکانی دیکەی ئەم میهرەجانە لە لایەن دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی سەرەتاییێک دروست دەکات بۆ ئەوەی بە فراوانی و قووڵی لەم گۆڤارەو خاوەنەکەی بکۆڵریتەوە ...

* *

## پەراوێزی باسەکە

(١) « تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامە نووسیی کوردیدا . د . کەماڵ مەزهەر ئەحمەد ل ـ ١٩ ـ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد بەغدا ـ ١٩٧٨

(٢) بڕوانە « الصحفی المحترف » جوون هوهنبرغ » ، تێگەیشتنی راستی » د . کەماڵ مەزهەر ئەحمەد ، پاشکۆی رۆژنامەی عیراق زمارە ـ ١٤ ـ نیسانی ١٩٧٨ ممتاز حیدری .

(٣) رۆژنامەی کوردستان لە ٢٢ ی ٤ ی ١٨٩٨ لە لایەن میقداد مەدحەت بەگەوە یەکەم زمارەی لە « القاهرە » دەرچووە .. بڕوانە « کوردستان » یەکەمین رۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ـ١٩٠٢ کۆکردنەوەو پێشەکی د . کەماڵ فوئاد .. هەروەها هەر دوو کتێبەکەی جەبار جەباری « مێژووی رۆژنامەگەری کوردی » بە زمانی کوردی و عەرەبی .

(٤) بڕوانە : بڕگەی یەکەمی سەرچاوەی پێشوو .

(٥) بڕوانە : د . عیزەددین مستەفا رەسووڵ « حول الصحافة الكردية » ل ـ ٥ .

(٦) بڕوانە : پاشکۆی رۆژنامەی عیراق زمارە ـ ١٤ ـ ی نیسانی ١٩٧٨ .

(٧ آ) من بەلای خۆمەوە یەکەم کەسم دەمەوێ لەم گۆڤارە بکۆڵمەوەو وتارێکیشم لە گۆڤاری بۆپێشەوە زمارە ـ ٢ ـ ی ساڵی ١٩٧٣ دا لە لاپەرە (٣١ـ٣٤) بڵاوکردۆتەوە .. ئەم گۆڤارە یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لقی هەولێر دەری دەکرد . تەنیا سێ زمارەی لێ دەرچووە . هەروەها جارێکی دیکەش لە پاڵ باسێکدا بە بۆنەوەی جەژنی رۆژنامەنووسی کوردییەوە کە لە نیسانی ١٩٧٧ کۆڕێك ساز کرا لەوێ دا چەند قسەیەکیشم دەربارەی « پەیژە » کرد .

دیسان بە بۆنەی یادی پەنجا ساڵەی « پەیژە »وە ٩٢٧ـ٩٧٧ وتارێکی بچکۆلانەم بە زمانی عارەبی لە رۆژنامەی « العراق »دا بڵاوکردەوە .

(٧ب) جەماڵ خەزنەدار لە « رابەری رۆژنامەگەری کوردی ، جەبار جەباری لە مێژووی رۆژنامەگەری کوردی بە زمانی کوردی و عارەبی . د . کەماڵ مەزهەر ئەحمەد لە « تێگەیشتنی راستی » ناوی گۆڤاری « پەیژە » وخاوەنەکەیان تۆمار کردووە .

(٨) مێژوونووسی بەناوبانگ محمد امین زکی لە کتێبەکەی « خلاصە تاریخ کوردو کوردستان » ، مامۆستا علاءالدین سجادی لە مێژووی ئەدەبی کوردی، ئەم دوو زاتە هەر دووکیان ناوی پەیژەیان نەبردووە .

(٩) بڕوانە : « الصحفی المحترف » جوون هوهنبرغ ، ترجمة فؤاد دیبساس ل ـ ٢٨٣ ـ چاپخانەی بیروت .

(١٠) کاتێ نموونە لە گۆڤارەوە وەردەگرم دەستکاری رێنووسەکەی دەکەم ، چونکە خوێندنەوەو تێگەیشتنی ئاسانترە .

(١١) دەقی ئەم بانگەوازەش لەگەڵ ئەو وتارەم بڵاوکردۆتەوە ، کە بە بۆنەوەی بیرەوەری پەنجا ساڵەی « پەیژە » لە رۆژنامەی « العراق » دا ساڵی ١٩٧٧ دا نووسیبوم .

(١٢) بڕوانە : گۆڤاری بۆ پێشەوە ، زمارە ـ ز ـ ی ساڵی یەك ل ـ (٣١) .

(١٣) مامۆستا گیوی موکریانی ١٩٠٣ لە شاری مەهاباد لە دایك بووە ، لە ٢٤ـ٧ـ١٩٧٧ دا کۆچی دوایی کردووە .. بڕوانە کتێبی لە یادی گیوی موکریانی دا ل ـ ٧٠٨ .

(١٤) شەمسەددین سلێمان سەلاح شور ساڵی ١٩٠٩ لە شاری رەواندوز لە دایك بووە .. برای مامۆستا عەلی حەیدەر سلێمانە .

(١٥) بڕوانە : گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات زمارە (١٥) ی ساڵی ٩٧١ـ٩٧٢ ل ـ ٤٥ تا ١٢ ـ بەتایبەتی ل ( ٥١ تا ٦٦ ) د . مارف خەزنەدار .

(١٦) بڕوانە : گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات زمارە ـ ١٥ ـ ل ـ ٧٦ ـ پاشکۆی زمارە (٣) .

(١٧) بڕوانە رۆژی کوردستان زمارە ـ ٤٣ ـ ٤٤ کانوونی یەکەمی ٩٧٦ ـ کانوونی دووەمی ١٩٧٧ل ـ٣٨ـ٤٦ د . مارف خەزنەدار .

(١٨) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو پەراوێزی ـ١٦ـ .

